١٧

# پەیامی ڕاستی

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەی گشتی یە

ساڵی دووەم * تەمووزی ١٩٩٣ ز * صەفەری ١٤١٤ک



ئۆزبەکستان ... وڵاتی سەمەرقەند و بوخارا

لەیادی چوارەمین ساڵرۆژی وەفاتی



مامۆستا شێخ محمدی خاڵ دا

خانەکانی شانەی هەنگ بۆ شەش لان ؟!



بسم الله الرحمن الرحيم

## لەم ژمارەیەدا

| بابەت | نووسەر | لاپەڕە |
|---|---|---|

# پەیامی ڕاستی

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەی گشتی یە
کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامیی کوردستان
دەری دەکات
ناونیشان : پۆستەی سلێمانی
ص . پ (١٠٦)

"پەیامی ڕاستی" لەم شوێنانە دەست دەکەوێت :

١) ناوەندی بڵاوکردنەوە ـ کتێبخانەی ڕۆشنبیر ـ سلێمانی
٢) کتێبخانەی ڕەسەن ـ هەولێر
٣) کتێبخانەی نهضة ـ دهۆک
٤) = نالی ـ هەڵەبجەی شەهید
٥) = برادۆست ـ هەڵەبجەی تازە
٦) = ڕۆشنبیری ـ هەڵەبجەی تازە
٧) = مەشخەڵ ـ ڕانیە
٨) = برایەتی ـ چەمچەماڵ
٩) = ڕۆشنبیر ـ دەربەندیخان
١٠) = مەولەوی ـ کەلار

سەرەڕای چەندین کتێبخانە و دەستفرۆشیی تر .

## وتەیەك

**خوێنەرانی خۆشەویست !**

**برایانی ڕۆژنامەنووس !**

ئاشکرایە کە کاری ڕۆژنامەگەریش وەک هەر چالاکی یەکی تری کۆمەڵایەتی-زۆرجار - وەرز و مەوسیمی تایبەتیی خۆی هەیە .. وە هەر کار و وەرزێکیش بەرپرسیاری پسپۆڕی خۆی هەیە ..

جوتیار لە مانگی (خەرمانان) و (گەلاوێژ) دا بە شادی و شانازی یەوە ئارەقی گەرما و ماندوویی دەسڕێ ..

قوتابی و مامۆستا بە گیانێکی تازەو ڕووکردنە چەشمەندازێکی دوا ڕۆژی زانستی، ڕوودەکەنە مانگی (ڕەزبەر) ..

پەلەوەر و باڵندە کۆچەرەکان بەبزەو گەشکەوە پێشوازیی (خاکەلێوە) دەکەن ..

ئاژەڵ و مەڕومالآت بەپەرۆشەوە دەچن بەپیریی مانگی (بانەمەڕ) و (گوڵان)ەوە ..

ئایا ئێمەی نووسەر و ڕۆژنامەنووس بەپێی وەرز و مەوسیمی پڕ ئاڵوگۆڕی کۆمەڵگەکەمان توانیومانە کارو ئەرکی خۆمان بەجێ بهێنین ؟ ئایا بەپێی پێویست توانیومانە دروێنەی هەوڵەکان بکەین و ، لەم وەرزی حاسڵاتەدا شارۆی بۆچوونەکان بکەین و ، بیانپارێزین لە هەرەشەی وەرزی (گەڵاڕێزان) و گزەی (سەرماوەز) ؟! چەند پرسیارێکن ئاراستەی خۆمان و هەموو ڕۆژنامەنووس و نووسەرانیان دەکەین ..

# ئیسلام

## سەرچاوەی خێر و چاکەیە بۆ مرۆڤ

ئەگەر بە وردی و بە دڵێکی هۆشیار و بە چاوێکی کراوەوە سەرنجێکی جیهانی دەوروبەرمان بدەین، ئاسمان و زەوی، شەو و ڕۆژ، مانگ و ئەستێرەکان، ئاو و هەوا، ڕووەک و درەخت، گوڵ و گوڵزار. باڵندە و گیانداران .. تێدەگەین ئەمانە هەموو شوێنکار و ڕواڵەتەکانی ڕەحمەت و بەخشندەیی پەروەردگاری مەزنی میهرەبانە .. ئەو پەروەردگارەی کە لەسەر ئەم سفرە ڕازاوەیەی دنیا هەموو پێداویستییەکی ماددی و مەعنەویی بۆ ئامادە کردووین .. مەخلوقات هەموو لە خزمەت و هاوکاری-

- کردنی مرۆڤدان ..

هەموو ئەم نازو نیعمەت و بەخششانە لە سیفەتی (ڕەحمەت)ەوە هەڵقوڵاون، ڕەحمەتی خوایی گشت دروست-

- کراوەکانی بوونەوەری گرتۆتەوە، بگرە مەخلوقات و بوونەوەرەکان هەر هەموو ڕواڵەت و شوێنکاری ڕەحمەتی پەروەردگارن .. بۆیە لە ژیانی ڕۆژانەماندا پێش ئەوەی دەست بدەینە هەر کارێک و هەر شتێک وا چاکە (بسم الله الرحمن الرحيم) بڵێین، بۆ ئەوەی ئەم ڕاستییەمان هەمیشە لە یاد بێت ..

ئیسلام که به رنامه ی خوایه
بۆ ژیانی مرۆڤ ، ئه ویش هه ر له
سیفه تی ره حمه ته وه هه لقولاوه ..
ره حمه ت له هه موو لایه نه کانیدا
ئاشکرایه .. ره حمه تێک که هه موو
پێچ و په ناو لاوازی و سیفه ته کانی
فیطره تی مرۆڤی له به رچاو گرتووه .
ره حمه تێک که له سه ر بنچینه ی
سیفه ته مه زنه کانی خوای
په روه ردگار دامه زراوه ،به تایبه تی
سیفه تی زانین و دانایی بێ پایان
( العلم و الحکمة ).

ئه و ئه حکام و یاسایانه ی
په روه ردگاری داناوزانا بۆمرۆڤی بڕیار
داوه له سه ر بنه مای ڕاستی ودادگه ریی
بێ هاوتاو بێ پایان بنیات نراوه ..
ڕاستی یه ک که هه لقولاوی سیفه تی
زانینه ( العلم المطلق ) ..
دادگه ری یه ک که له سیفه تی
دانایی ( الحکمة المطلقة ) یه وه
سه رچاوه ی گرتووه ..

ئایه ته کانی قورئانی پیرۆز
به ڕوونی ئاماژه بۆ ئه م مه سه له یه
ده که ن :
(( یُرِید اللّهُ لِیُبیّنَ لکم و یَهدِیَکُم
سُنَنَ الذینَ مِن قَبلکم وَ یَتُوبَ
عَلیکم و اللّهُ عَلیمٌ حکیم *
وَ اللّه یُرید أن یتوبَ عَلیکم و یُرِیدُ
الذینَ یَتَّبِعون الشَّهواتِ أن تَمیلوا
مَیلاً عَظیماً * یُرِیدُ اللّهُ أن
یُخَفِّفَ عَنکم و خُلِقَ الانسانُ ضَعیفاً ))
سوره تی (النساء) / ٢٦، ٢٧، ٢٨ ..

به ڕاستی ئیسلام هه ر هه مووی
ره حمه ته بۆ مرۆڤ ، سه رچاوه ی
خێرو چاکه ی دنیاو قیامه ته .. هه ر
ئه وه نده نی یه که ره زامه ندیی خوای
تێدایه و چی تر .. هه رچه نده ئه مه ش
خۆی له خۆیدا زۆر گرنگ و بایه خداره..
به لام له گه ل ئه وه شدا سه رچاوه ی
خێر و چاکه یه بۆ مرۆڤ ، تاک بێت
یان کۆمه ل .. چونکه دانراوی خوایه
ئه و خوایه ی مرۆڤی دروست کردووه ،
بوونه وه ر و مه خلوقاتیشی دروست
کردووه .. بۆیه ئیسلام خاوێنه له
هه موو که م و کووڕی یه ک .. پارێزراوه
له هه موو سیفه تیکی ناته واو که
دوچاری مرۆڤ ده بێت له که مزانین و
نزیک بینی و ئاره زوومه ندی و
خۆ په رستی ..

ئیسلام ئه و به رنامه گشتی یه یه که
پێکه وه گونجانێکی تێروته واو پێک دێنێت
له نێوان جووله ی مرۆڤ و جووله ی

گه ردووندا بۆ گه یشتـــن بـــه و پله یه ی که بۆی دیاری کراوه له سه ر ڕێبازی ته واوخوازی ..

ئیسلام به رنامه ی به جێهێنانی ئه رک و فرمانی خیلا فه ته لـــه زه وی دا .. خیلا فه ت و جێنشینیی خوا به و مانا فراوان و گشتی یه ی که قورئان داوای ده کات، واتـــه : په روه رده کردنی مرۆڤ و ئاوه دان - کردنه وه ی زه وی به گوێـــره ی به رنامه ی خوایی .. ئـــه مه ش ناوه ڕۆکی به جێهێنانی ئه رکی به ندایه تی یه بۆ پـــه روه ردگاری مـــه زن .. (( وَ ما خَلَقتُ الجِـــنَّ و الانس اِلاّ لِیعبُـدون )).

ئیسلام نه ک هه ر زیـــان و به رژه وه ندی له ده ست دانـــی ڕاسته قینه ی مرۆڤی تێدا نی یـــه .. به ڵکو سه راپا هه مووی خێـــر و چاکه و دڵنیایی و حه وانه وه یه بـــۆ دڵ و مێشک و له شی مرۆڤه کان ..

هه موو ئه حکام و بڕیاره کانی بـــۆ مه به ستی پاراستنی به رژه وه ندی یـه سه ره کی یه کانی مرۆڤـــه ..

مرۆڤ ئه گه ر به جوانی لـــه ئیسلام تێ بگات هه رگیـــز ده ست به رداری نابێ. و ... هیچ به رنامه و پرۆگرامێکی ... ـــری ناگۆرێـــته وه .

هۆی سه ره کیی دووره په رێزیی خه ڵکی له ئیسلام ده گه ڕێته وه بۆ نه شاره زایی و نه زانینیان له باره ی ئیسلامـه وه ..

بـــۆیـــه ڕوونکردنـه وه و ڕاگه یاندنی ئیسلام به شێوه یه کی جوان و ڕێـک و پێک ئه رکی سه رشانی هه مـــوو خاوه ن ئیمانێکه .. به تایبه تـــی ئه وانه ی خۆیان به بانگخوازانـــی ڕێگای ئیسلام ده زانن .. بۆ هێنانه دیی ئه م مه به سته پیرۆزه ش پێویستـــه سێ خاڵـــی یه ک له دوای یـــه ک و پێکه وه به ستراو تێبینیی بکرێت :

یـــه کـه م : تێگه یشتنێکـــی قـــووڵ و فراوان و ڕێک و پێک لـــه ئیسلام ..

دووه م : به جێ هێنانی کـــرداری ڕاست و دروست له لایه ن خـــاوه ن ئیمانه وه ..

سێـیه م : هه ڵسان بـــه پێشکه ش کردن و ڕاگه یاندنـــی، به شێواز و شێوه یه کی جـــوان و دڵـگیر و سه رنج ڕاکیش ..

ئێمه نکوولی له وه دا ناکه یـــن

کە زۆربەی موسڵمانان ئەمڕۆ بێئاگان لە ئیسلام یان بەلای کەمەوە بەچاکی و بەجوانی لە ئیسلام تێنەگەیشتوون، لە ئەنجامی ئەوەشدا لە بەجێ- ـهێنانی کرداری و لە شێوازی پێشکەش کردنیشدا بێگومان هەڵە دەکەن ..

ئەو هەڵەیەش زیان بە ئیسلام و زیان بەوانەش دەگەیەنێت کە دوورن لە ئیسلامەوە ..

بەڵام ئەوانەی خاوەنی فیکرو ئەیدای ڕاستی و حەقیقەتن هەق وایە بە ئاسانی کۆڵ نەدەن و پشت لە ڕاستی هەڵ نەکەن .. بەڵکو پێویستە سوور بن لەسەر باس و لێکۆڵینەوە و گەڕان بەشوێن ڕاستیدا، چونکە چارەنووسی ژیانی مرۆڤ لەسەر ئەم مەسەلەیە بەندە .

دەستەی نووسەران

**خوێنەران و هاوڕێیانی بەڕێز !**

وا بۆ جارێکی تریش چەند تێبینییەک بۆ ئەو برا و خوشکانەی کە بەرهەم و نووسراو بۆ ( پەیامی ڕاستی ) دەنێرن دەخەینە پێش چاو :

١ - با بابەتەکە بنێرن تەسەل بێت و، بەخەتێکی ئاشن و جوان بنووسرێت و، دەستبڕ بینێررێت ..

٢ - کوژاندنەوە و زیادە سەرخستنی تێدا نەبێت ( پاش نووسینی )، بەواتای ئەوەی ئەو بابەتەی دەنێردرێت با ( مسودە ) نەبێت .. بەڵکو پاش پێداچوونەوە ئارەنووس بکرێت و پاشان بنێردرێت ..

٣ - چەندە بکرێت بابەتەکان وێنە و هێڵکاری یان لەگەڵدا بێ باشترە، چونکە ئەوانە بابەتەکان بەپێزتر و بابەتخوازتر دەکەن ..

٤ - ئاماژەی تەواو بکرێت بۆ ئەو سەرچاوانەی کە سوودیان لێ وەرگیراوە بۆ نووسینی بابەتەکە ..

٥ - ئاماژە بکات بۆ ناونیشان و پیشە و پلەی ڕاستیی خۆی ..

هیوادارین ڕەچاو بکرێن، لەگەڵ ڕێز و سوپاسماندا ..

قۆناغی سێیه می بانگه وار

# پێکهێنانی کۆمه ڵگه و ده وڵه ت

ماموستا عمر عبد العزیز

**خوێنه رانی هێژا !**

لــــه ئه ڵقه پێشووه کانــدا ئاماژه مان کرد بۆ قۆناغی یه که م و دووه مـی بانگه وازی ئیسلامی له سه رده می یه که می دا ..

له م جاره دا به پێویستی ده زانین که باسێک بکه ین له قۆناغـــــــه دوایی یه کانی بانگه وازی ئیسلامی ، که به کۆچکردن ده ستی پێکــــــرد و بــــــه پێکهێنانی کۆمه ڵگه و ده وڵه ت دامـــه زرا ..

**زه مینه خۆش بوون :**

پاش ئه وه ی هه موو شێوه کانـی چه وسانه وه ی سته مکارانی مه ککـه بۆ بڕواداران تاقی کرانــــــه وه ، پێغه مبه ری خوا (درودی خــــوا ی له سه ر بێت) له سالی پێنجه مـــی پێغه مبه رێتی دا فه رمانی ده رکـرد بۆ یارانی که ده ست بکه نـــــه کۆچ کردن .. بۆ ئه و مه به ستــــه ش ولاتـی (حه به شه) ی هه ڵبژارد ..

ده رباره ی هه ڵبژاردنی ئـــــه و ولاته و ، شێوه ی کۆچ کردنه کــــه و ، که سانی کۆچ کردوو ، باشتر وایــــه چه ند خالێک بخه ینه پێش چاو :

١ ـ هه رچه ند یه کێ له هۆکاره کانـی کۆچکردن تین گرتنی ئازاروچه وسانه وه بوو ، به لام له ڕاستی دا ئه مه ته نهـا هۆکاری کۆچ کردن نه بوو ، چونکه کاتێ

سه یری ناوی که سه کۆچ کردووه کان ده که ین بۆمان ده رده که وێ زۆرێکیان له وانه ن که له به رهه‌ندێ ئیعتباری خێڵه کی ئازاریان نه ئه درا وه کێ جه عفه ری کوری ابوطالب و ابو موسیٰ ی ئه شعه‌ری وعوسمانی کوری عه ففان و زوبێری کوری عه ووام، یا (ام حبیبة)ی کچی ابو سفیان، که باوکی ئه وبوو ئازاری موسڵمانه کانی ده داو مه عقول نه بوو ئه و هه رگیز ئازار بدرێ .. که واته مه به ستێکی تری گرنگێ له و کۆچه دا هه بوو که (گه یاندنی بانگه وازی خوا) بوو به وڵاتانی ده ره وه .

٢ ـ هۆی هه ڵبژاردنی ئه و وڵاته ش له خودی فه رمانه که ی پێغه مبه ردا (دروودی خوای له سه ر بێ) راسته وخۆ به دیار ده که وێ، کاتێ فه رمووی: که س لای پادشای ئه و وڵاته ئازاری نادرێ .

٣ ـ جگه له وه ش پێ ده چێ که ئیستراتیجیه تی شوێنه واری جوگرافیی حه به شه له پێش چاو گیرابێ ، به تایبه تی کاتێ ده بینین که که وتۆته که نار ده ریای سوور و ده ریای عه ده ن .. گرنگیی ئه م سێ خاڵه ش له سێ لایه نه وه یه :

له سه رێکه وه باری ئابووریی باش بووه و که متر خه می ئه و لایه نه ی کۆچکردووان خوراوه .. له سه رێکی تره وه له ڕووی ئاسایشی یه وه به ئاسانی ده ستی ملهوڕانی (مه ککه) یان نه ده گه یشتێ، هه رچه نده وه کێ نوێنه ریش چووبن، به لام وه کێ سوپاو جه نگاوه ر نه یانتوانیوه خه یاڵی وا بکه ن .. له ڕووی ڕۆشنبیریشه وه به حوکمی جێ و ڕێ و سیستمی حوکمی ئایینی وڵاته که، دانیشتوانی ئه وێ له هه ر کۆمه ڵگه یه کی تری ئه و سه رده مه ی دراوسێی عه ره ب زیاتر لێهاتن و تیابوونی وه رگرتنی په یامی خوایان بووه ، ئه مه ش به موسڵمان بوونی (نه جاشی) ی پادشاو چه ند که سێکی هاوکاری زیاتر ده سه لمێ ..

٤ ـ پێغه مبه ری خوا (دروودی خوای له سه ربێ) تاکتیکی کۆچ کردنی قه تیس نه هێشته وه له حه به شه دا، به ڵکو که وته بیری شوێنانی تر ، بۆیه به رده وام له وه رزی حه ج کردندا په یوه ندیی ده به ست به خێڵ و هۆزه عه ره بانه کانه وه . تا سه ره نجام له مه دینه زه مینه یه کی

نوێ ساز بوو.. وادیارە ئەم نەخشە کێشانەی کۆچکردن لە ساڵی پێنجەمەوە تا دەیەمی پێغەمبەرێتی بەردەوام بووبێ، جا ماوەیەکێ لە بیری (حەبەشە) داو ماوەیەکی تر لە بیری (طائف) داو، ساڵانی ٨ و ٩ و ١٠ ی پێغەمبەرێتی نەخشەی سازدانی کۆمەڵگەی مەدینە کێشراوە..

**کۆمەڵگەو دەوڵەت :**

(مصعب) ی کوڕی (عمیر) ی نوێنەری پێغەمبەری خوا لە مەدینە، لە ڕاپۆرتی ساڵی دەیەمدا ڕایگەیاند کە زۆربەی ماڵانی مەدینە ئیسلامیان تێ چووەو، گەیاندی کە زەمینە فەراهەمەو، کۆچکردووان و پشتیوانان چاوەڕێی هیجرەتی سەرکردەن..

لە سەرێکی ترەوە، لە مەککە کەسێکی وا نەما کۆچ بکات جگە لە پێغەمبەری خواو ابوبکرو چەند کەسێکی تر.. بەو جۆرە هۆکارە زەمینییەکان ڕەخسان و کاتی فەرمانی خوای گەورە هات دەربارەی کۆچ کردنی سەرکردە، بۆیە ئەویش بێ پەروا کۆچی کرد لە داستان و مەلحەمەیەکی مێژوویی پڕ دەرس و پەنددا کە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتیی دەوێ..

**هەنگاوە سەرەکییەکانی پێکهێنانی دەوڵەت :**

قۆناغی یەکەمی دروست کردنی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە مەدینە بە دروست کردنی جێگای بەندایەتی و مەڵبەندی گشتیی کۆبوونەوەی بڕواداران دەستی پێ کرد، (مزگەوت) کە لە ڕاستیدا بێشکەی ژیاری ئیسلامی و، یەکەم قاتی کۆشکی شارستانییە..

هەنگاوی دووەم دروستکردنی برایەتی بوو لە نێوان پشتیوانان و کۆچەراندا کە بووە پێکهێنەری کۆمەڵگەیەکی یەکێ کە وتەی تەباو هاوکار..

پاش ئەوە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لە سەربێ) پەیمان-نامەیەکی مۆر کرد بۆ دانیشتوانی مەدینەو، باسی (ئەرکێ و فەرمانەکان)ی هەموو دەستەو چین و توێژەکانی کۆمەڵگەی مەدینەی تێدا تۆمار کرد.

بەم سێ کارە گرنگێ و بایەخدارە پێغەمبەری خوا پلە سەرەتاییەکانی

ده وڵه‌تداریی دامه‌زراند و، پاشتریش که‌وته‌ بیری بانگه‌واز گه‌یاندن به‌ هاوسێ نزیکه‌کانی ده‌وروبه‌ری مه‌دینه‌، بۆیه‌ ده‌ستی کرده‌ ناردنی نوێنه‌رو، یارانیشی به‌رده‌وام په‌یوه‌ندی یان ده‌به‌ست به‌ خێڵ و هۆزه‌ دراوسێکانه‌وه‌ .

**نوێنه‌ر ناردن به‌ وڵاتاندا :**

له‌ قۆناغێکی دواتردا، پێغه‌مبه‌ری خوا نوێنه‌ری نارد بۆ لای زۆربه‌ی پاشا و سه‌رۆکه‌کانی ئه‌و سه‌رده‌مه‌، ( هرقل ) ی قه‌یصه‌ری ده‌وڵه‌تی بیزنطی، ( کسری )ی پادشای ده‌وڵه‌تی ساسانی ، ( مقوقس ) ی پادشای ( قبط ) ، پادشای مصر و اسکندریه‌ ، ( نه‌جاشی ) ی پادشای ( حه‌به‌شه‌)، ( منذر ) ی ئه‌میری ( به‌حره‌ین ) ، ( هوزه‌ ) ی ئه‌میری ( یه‌مامه‌ ) ، ( جیفر و عبّاد) دوو ئه‌میری ( عمان ) . .

نوێنه‌ره‌کان هه‌موو نامه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوایان پێ بوو، کاکڵه‌ی هه‌موو نامه‌کان بانگ کردنیان بوو بۆ ئیسلام .

له‌ ڕاستیدا په‌یوه‌ندی یه‌ دیبلۆماسی یه‌کانی پێغه‌مبه‌ری خوا له‌ ئاستێکدا ، که‌ له‌ مێژووی سیاسی له‌وه‌و پێشدا هه‌رگیز نه‌بینرا بوو.. ته‌نانه‌ت زۆرێک له‌ مێژوونووس و خۆرهه‌ڵاتناسانی ئه‌وروپی وه‌ک ( گۆستاف لۆبۆن ) و ( زیگرید) ده‌ڵێن : (( محمد یه‌که‌مین که‌س بوو که‌ سه‌فیرو باڵیۆزی نارد و، به‌ڵێنی پاراستن و ئه‌منیه‌تی باڵیۆزانی وڵاتانی بیگانه‌ شدا، محمد یه‌که‌م که‌س بوو که‌ ڕێزی گرت له‌ په‌یماننامه‌وه‌ ده‌وڵه‌تێکی گه‌وره‌و بایه‌خداری وای پێک هێنا که‌ مێژوویه‌کی پڕ له‌ دیبلۆماسیه‌تی هه‌یه‌ و ڕێ خۆشکه‌ر بوو بۆ حکومه‌تدارانی دوای خۆی )) '١'

له‌ ڕاستیدا تازه‌ و پێشکه‌وتووترین بڕیارنامه‌ نێوده‌وڵه‌تی یه‌کان له‌ مه‌ر په‌یوه‌ندیی دیبلۆماسی یه‌وه‌ ـ که‌ له‌ لایه‌ن سه‌رۆک و پادشایانی جیهانه‌وه‌ مۆرکراون ـ هیچێکی تازه‌یان نه‌هێناوه‌ که‌ له‌ و سه‌رده‌مه‌ی ئیسلامدا ڕه‌چاو نه‌کرابێ . . ته‌نانه‌ت بڕیارنامه‌ی ( ڤیه‌نا ) که‌ له‌ ١٨ ی نیسانی ١٩٦١ له‌ ( ٥٠ ) بڕگه‌دا

'١' د . محمد التابعي / الدبلوماسية في الاسلام/ل ٦٥ .

مۆرکرا ، خاڵێکی تێدا نی یه که له بار بێت و ئیسلام چوارده سه ده له مه و پێش په سه ندی نه کرد بێ .

**ئه حکامه کانی قورئان :**

له سه رێکی تره وه به گوێره ی خواسته ده روونی و کۆمه ڵایه تی یه هه مه جۆره کانی کۆمه ڵگه ی ئه و سه رده مه ، قورئانی پیرۆز په یتا په یتا ( ئه حکامه ) کانی ده هاتنه خواره وه .. به ڵام له شێوه و قاڵبێکدا که بۆ هه موو سه رده مێکی مێژووی مرۆڤایه تی بگونجێن .

**ڕووبه ڕوو بوون له گه ڵ نه یاراندا :**

بێگومان ئه م فراوان بوونه ی ڕکێفی ئیسلام و په ل هاویشتنی بانگه وازه که ی به جیهاندا نه یارانی ئیسلامی ئازاردا ، به تایبه ت قوره یش که شه ڕی مان و نه مانی ده کرد له گه ڵ موسڵمانان ، بۆیه که وتنه پیلان گێڕان دژی ده وڵه تی نه وپای ئیسلامی .

ئه م به شه ی باسه که خۆی له خۆی دا لێکوڵینه وه یه کی تایبه تیی ده وێ ، بۆیه به پێویستی ده زانین که له ئه ڵقه یه کی ته رخان کراودا قۆناغی ( ڕووبه ڕووبوون له گه ڵ نه یاران ) که هاوشان له گه ڵ قۆناغی ( بانگه واز گه یاندن له جیهاندا ) ده ستی پێ کرد ، بخه ینه به ر تیشکی توێژینه وه .. دیاره ئه و کاره ش پیاچوونه وه یه کی وردی ( غه زاکان ) ی ده وێ و ، پێویستی به شیکردنه وه ی هۆکار و زه مینه ی په یدابوونیان هه یه ..

بۆیه - به پشتیوانی خوا - له ئه ڵقه یه کی داهاتوودا ئه و قۆناغه دوو له قانه ی (ده عوه ت گه یاندن و ڕووبه ڕووبوون ) شی ده که ینه وه .



# تیشکێک لەسەر یاساکانی خوایی

## لەژیانی تاک وکۆمەڵدا

ماموٚستا
هادی عەلی

پەروەردگاری داناو زانا دوو جۆر یاسای لەبوونەوەرو ژیاندا بڕیار داوە .. کاروباری ژیانی ئادەمی دەبێ بەپێی ئەو دووجۆرە یاسایە ڕێک بخرێت، ئەگەر بیەوێت بەچاکی هەستێت بە بەجێهێنانی ئەرکی خیلافەت لە بواری پەروەردەکردنی خۆی و ئاوەدانکردنەوەی زەویدا ، بۆ ئەوەی مەبەست لە هێنانە دیی خۆی بەلمێنێت .. کە بریتی یە لەبەندایەتی کردن ( العبودیة ) بۆ بەدیهێنەرو پەروەردگاری هەموان .

ئەو دوو جۆرە یاسانەش بریتین لەمانە :

**یەکەم :**

یاسا گەردوونی یەکان ، واتە ئەو کۆمەڵە ڕێساو یاسایانەی کاروباری گەردوون و ژیانیان لەسەر دامەزراوە .

**دووەم :**

شەریعەتی ئیسلامی ، کە سەرچاوەکەی بریتی یە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری مەزن ( درودی خوای لەسەر بێ ) .

لەبەرامبەر هەردوو جۆرە یاساکەوە مرۆڤ دەتوانێت هەڵوێستی بەجێهێنان و سەرپێچی کردنی هەبێت . لەهەمان کاتدا خوای پەروەردگار پاداشت و سزای بو هەڵوێستی مرۆڤ

بڕیار داوه له ژیانی دنیادا یان له ڕۆژی دوایی‌دا ، وه یان له هه‌ردوکیاندا ..

ژیانی پێغه‌مبه‌ری مه‌زن (درودی خوای له سه‌ر بێ) به جیهانی کرداریی ڕاست و دروسته ، که هه‌ردوو جۆره یاساکه‌ی پێکه‌وه گونجاندووه به شێوه یه‌کی ورد و پێوانه‌یی ..
هه‌ر بۆیه خوای گه‌وره به ڕوونی له قورئاندا داوا له مرۆڤه بڕوا - داره‌کان ده‌کات ژیانی ئه‌و پێغه‌مبه‌ره مه‌زنه بکه‌نه سه‌رمه‌شق و پێشه‌وای خۆیان :
(( لَقَد كانَ لَكُم في رَسولِ اللهِ أُسوَةٌ حَسَنَةٌ لِمَن كانَ يَرجو اللَّهَ وَاليَومَ الآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثيراً ))

الاحزاب /٢١

هه‌ر گیروگرفت و هه‌له‌یه‌ك که مرۆڤ تێی‌ده‌که‌وێت له ژیانی تاکێتی یان کۆمه‌ڵی‌دا .. بێگومان هۆکه‌ی ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ پشت گوێ خستن ، یان سه‌رپێچی کردنی یه‌کێك له‌و دووجۆره یاسایه یان هه‌ردوکیان.
مرۆڤ ده‌توانێت له به‌رامبه‌ر هه‌ر هه‌له و کێشه‌یه‌که‌وه‌که دێته ڕێی ، به‌کێك له‌م دوو هه‌لوێسته‌ی هه‌بێ : یان ئه‌وه‌تا بڕیار بدات که به پێی یاساو به‌رنامه‌یه‌ك ڕووی داوه و ، ده‌توانرێت که شف بکرێت و له پاشا کۆنترۆڵیش بکرێت .. وه یان نه‌خێر هیچ جۆره یاساو به‌رنامه‌یه‌ك له‌و بواره‌دا نی‌یه .. به‌ڵکو هه‌روا به شێوه‌یه‌کی غه‌یبی‌وئالۆز ڕووده‌دات و، مرۆڤ هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ی بۆ ده‌کرێت ته‌سلیم ببێت هیچی‌تر .
ئێستا با ئه‌م مه‌سه‌له به نموونه‌یه‌ك ڕوون بکه‌ینه‌وه :
زانستی پزیشکی بریتی‌یه له‌و ڕێساو یاسایانه‌ی که سه‌لامه‌تیی له‌ش و نه‌خۆشی‌یه‌کانی له سه‌ر به‌نده .. پزیشکه‌کان به هۆی ئه‌م زانسته‌وه ده‌توانن کۆنترۆڵی ئه‌و یاسایانه بکه‌ن و ، به ڕێگای جیاجیا به‌کاریان بهێنن بۆ چاره‌سه‌رکردنی نه‌خۆشی‌یه‌کان به واتایه‌کی‌تر ده‌توانن ئه‌و یاسایانه ته‌سخیر بکه‌ن ، به‌لام ئه‌و که‌سه‌ی ئه‌م زانسته نه‌زانێت بێگومان ڕێگای ته‌سخیرکردنیشیان نازانێت ..
قورئانی پیرۆز ڕووداوه‌کانی ژیانی مروڤ به پێی زنجیره یاسا یه‌کی به‌رنامه‌کراو لێك ده‌داته‌وه .. هه‌ر

کاتێکێ هۆیەکان و پێشەکییەکان تەواو کران، ئەوا شوێنکارو ئەنجامەکانیشیان ـ بە ئیزنی پەروەردگار ـ دێنە دی. مرۆڤیش دەتوانێت سەرنج لەو یاسایانە بدات و لێیان تێبگات و، بەرنامەیەکی لێکدانەوە وشیکردنەوەیان لەسەر دابڕێژێت و، چۆنێتیی پەیوەندیی نێوان ڕووداوەکان دیاری بکات.. هەروەها پەیوەندیی نێوان پێشەکییەکان و ئەنجامەکانیشیان بزانێت.

هۆی گیرو گرفتەکان ـ لە ڕوانگەی قورئانەوە ـ دەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤ خۆی.. واتە بۆ ئەوستەم و ناڕەواییەی مرۆڤ دەرهەق خۆی دەیکات.. ئایەتەکانی قورئان ئەم مەسەلەیە بەجوانی ڕوون دەکەنەوە:

(( ذلكَ بأنّ اللَه لَم يكُ مُغيّرًا نِعمةً أنعمها علىٰ قومٍ حتّىٰ يغيّروا ما بأنفسهم )) / الانفال ـ ٥٣ .

(( ألَم يَروا كم اهلكنا مِن قبلهم من قرنٍ مَكنّاهم في الأرضِ ما لم نُمكّن لكم و أرسلنا السّماء عَليهم مِدرارًا و جَعلنا الأنهارَ تَجري مِن تَحتهم فأهلكناهم بِذنوبهم و أنشانا مِن بَعدهم قرنًا آخرين ))

الانعام/٦

ئەم ئایەتانە بەجوانی ڕووناکی دەخەنە سەر گۆشەیەکێ لە ڕوانگەی ئیسلامی بۆ ڕووداوەکانی مێژوو..

ئەوەش ئەوەیە: گۆڕان ـ لە پێش هەموو شتێکەوە ـ لە دەروونی مرۆڤدا ڕوودەدات لەلایەن مرۆڤ خۆیەوە.. لە ناوچوونی نەوەکانی مرۆڤ و جێگرتنەوەیان بە پێی یاسایەکی بەردەوام ڕوودەدات.

گوناهەکانیش کە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی پەروەردگارن خاوەنەکانیان لاواز دەکات و سەرەنجام لەسەر شانۆی مێژوو ڕادەماڵرێن و، چینێکی تر جێگەیان دەگرێتەوە.

یەکێکێ لە ستەم و ناڕەوایییانەی مرۆڤ دووچاری خۆیی دەکات ئەوەیە کە پەیوەندیی تەسخیرکردن (العلاقة التسخيرية) لە نێوان مرۆڤ و کۆمەڵ و بوونەوەردا نەبینێت.. ئەو کاتە خۆی پشت گوێ دەخات و، کارێکێ ناکات کە بتوانێت ژیان و بوونەوەر بە پێی یاساکانی خوایی تەسخیربکات بۆ خزمەت کردنی خۆی.

ڕه وتی کرداره کانی ژیانی تاکێ و کۆمه ڵهه ر وه کێ چۆنیێتیی کارکردنی له ش و ئامێره کانه .. بۆ ئیش کردنی ئامێره کان و ئه ندامه کانی له ش به شێوه یه کێ ڕا هاتووین که هه ر کاتێکێ له کار که وتن دڵنیاین که نوقسانی یه کێ ڕوویداوه ، ئه گه رچی زۆر بچووکیش بێت .. بۆیه ڕاسته وخۆ ڕا ده که ین بۆلای وه ستا یان پزیشکێ .. که چی سه یر له وه دایه له بواری کرداره کانی ژیانی(مه عنه وی) ماندا ئه م په یوه ندی یه بڕیار ناده ین و کاری له سه ر ناکه ین .

ده رکه وتنی ئه نجامه کان تا راده یه کی باش به ستراوه به سوود وه رگرتن له هۆکاره کان و ، ته واوکردنی پێشه کی یه کانیان .. ڕاسته مرۆڤ ئیش کردنی له سه ره و ئه نجامه کان به ده ستی خوان .. به ڵام ده بێ ئه وه ش بزانین که نه گه یشتن به ئه نجام مانای ئه وه یه مرۆڤ ڕێگای ڕاست و دروستی نه گرتۆته به ر و پێشه کی یه پێویسته کانی ته وا و نه کردووه .

خاوه ن ئیمانی هۆشیار ته نانه ت له هاتنه خواره وه ی فریشته کانیشدا بۆ پشتگیری کردن و یارمه تی دانی سه ربازانی ئیسلام ، ئالۆزی و بێ-هۆکاری یه کێ به دی ناکات .. چونکه ئه وه ش به پێی یاسای تایبه تیی خۆی ده بێ ، که بریتی یه له ته واوکردنی پێشه کی یه کان و سوود وه رگرتن له هۆکاره کان ، وه کێ ئه وه ته نها خوا به په روه ردگار و په رستراو دابنرێت و ( استقامة ) بکرێته ڕه وشت و صه بر و ته قوا توێشووی ڕێگای بێت .. ئه وه تا ئایه ته کانی قورئان به ڕوونی ئه م ڕاستی یه ده سه لمێنن :

((إنّ الذين قالوا ربُّنا اللّه ثُمّ آستقاموا تَتنزّلُ عليهم الملآئكة ألاّ تخافوا و لا تَحزنوا ..))/ فصلت ـ ٣٠

(( بَلىٰ إنْ تَصبروا و تتّقوا و يأتُوكُم مِن فَورهم هذا يُمدِدكُم ربُّكم بخَمسةِ آلافٍ منَ الملآئكةِ مُسوّمين ))

آل عمران/١٢٥ .

مامه ڵه کردن له گه ڵ یاساکاندا که له بواری ئیشکردنی ئامێر و سه لامه تیی له ش دا کاری پێ ده کرێت پێویسته له بواری کارکردنی تاکێ و سه لامه تیی ژیانی کۆمه ڵیشدا

بەکاربهێنرێت . پێغەمبەری خۆشەویست ( درودی خوای لەسەر بێ ) لە فەرموودەکانیدا بەجوانی ئەم مانایە ڕوون دەکاتەوە کە پەیوەندییەکان لە ژیانی فیکری و عەمەلیی موسڵماندا وەک پەیوەندیی نێوان بەشەکانی بیناو لەشی مرۆڤە ..

(( المؤمن لِلمؤمن كالبُنيان يشدّ بَعضُه بعضًا ـ ثم شبّكَ بين اصابعه )) / البخاري .

(( مَثلُ المؤمنين في توادّهم و تراحمهم كمثل الجسد الواحد اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر و الحمّى )) البخاري . *

oooooooooooooooooooooooooo

* سوود لەم سەرچاوەیە وەرگیراوە :

جودت سعيد / "حتى يغيروا ما بانفسهم "

بحث في سنن التّغير في النفس و المجتمع .

((ئادەمی دروست بووە لە دوو شت یەکەم جەستە، دووەم گیان.. جەستە هێلانەو قەفەسی گیانە، هەروەک گیان بولبولی ناو ئەو قەفەسەیە.. کە وابوو بەشی گرنگ لە ئادەمیدا گیانە کە بەتی نەک جەستەکەی، چونکە بولبولی یە بێ قەفەس نرخێکی هەیە. بەڵام قەفەسی بێ بولبول هەرچی نرخی نییە نیە.

بەڵام خۆراکی گیان ناسینی خوایە لەگەڵ پەرستنیا، وە تێگەیشتنە لە دینە تەواوی، کە سێک ئەگەر هەر خۆراکی جەستە بێت بە بێ خۆراکی گیان، یا خەریکی خۆراکی گیان بێت بە بێ خۆراکی جەستە، تەرازووی ئادەمێنی یەکەی لاسەنگ دەبێت، وەک یەکێک کە هەر بە چاوێکی ببینێت، وە چاوەکەی تری هەمیشە بنووقێنێت.

لە مەوە دەردەکەوێت کە هەروەک لەش بە بێ خۆراک نازی گیانیش بە بێ خۆراکی تایبەتی خۆی نازی)) .

ناڵەی دەروون/ ب ٢ ل ٩٠



# ئۆزبەکستان

## وڵاتی سەمەرقەند و بوخارا

ئەندازیار فاروق حسین محمد

ئۆزبەکستان یەکێکە لە کۆمارە ئیسلامییەکانی سەر بە یەکێتیی سۆڤیەتی جاران .. ئەمڕۆ نزیکەی (٢٠) ملیۆن کەس ژمارەی دانیشتوانیەتی، کە زۆربەیان موسڵمانن .. ڕووبەرەکەی نزیکەی (٥٠٠،٠٠٠ کم٢) یە .. ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە ڕووبەری ئەم وڵاتە ئیسلامییە لە ڕووبەری هەموو وڵاتەکانی (بریطانیا و بەلجیکا و هۆڵەندا و نەمسا و سویسرا) پێکەوە زیاترە ..!

ئەم وڵاتە بێجگە لەوەی کە وڵاتێکی کشتوکاڵییە - بەتایبەتی لە ئاڵتوونی سپی (لۆکە) دا کە لە دوای ئەمریکا و چین بە پلەی سێیەم دێت - ئاڵتوونی ڕەش (نەوت) یشی هەیە .. هەروەها گازێکی سروشتیی زۆریش لە ناوچەی (بوخارا) دا دۆزراوەتەوە .. (طاشقەند) پایتەختیەتی و، ناوچە گرنگەکانی (بوخارا) و (سەمەرقەند) و (خواریزم) کەوتوونەتە ئەم وڵاتەوە ..

**ئیسلام چۆن گەیشتە ئۆزبەکستان ؟!**

دەگێڕنەوە پێشەوا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە سەردەمی خیلافەتیدا، کۆمەڵێک لە خەڵکی شاری (سەمەرقەند) هاتنە لای و، شکاتی (قتیبەی کوڕی مسلم)ی

باهلی ) یان کرد که سه رکرده ی
له شکری موسڵمانان بوو بۆ
رزگارکردنی ئه و ناوچانه ، وتیان
گوایه موسڵمانه کان به ناڕه وا
هاتوونه ته ناو شاره که یانه وه ..

ئه ویش خێرا نامه یه کی نووسی و،
تیایدا داوای کرد که بۆ ئه و
مه سه له یه ( قاضی ) یه کێ
ته رخان بکات تا مه سه له که
بخات به لایه کدا ، ته نانه ت
ئه گه ر به ده رچوونی موسڵمانه کان
له شاری ( سه مه رقه ند ) یش
کۆتایی پێ بێت ..

ئه وه بوو ( جمیع ی کوڕی
حاضر ) کرایه قاضی بۆ ئه و
مه سه له یه و،
به ده رچوونی
موسڵمانه کان له شاری(سه مه رقه ند)
کۆتایی پی هات ، پاشان موسڵمانه کان
به بێ جه نگ چوونه ناو شاره که وه و،
به م شێوه یه ئیسلام گه یشته
ئۆزبه کستان ..

**ده وری ئۆزبه کستان له دروستکردنی شارستانیتی ئیسلامی دا :**

ئاسیای ناوه ڕاست به
گشتی و ئۆزبه کستان به تایبه تی
ده ورێکی گرنگیان هه بووه له
دروستکردنی شارستانیی ئیسلامیی
جیهانی دا .. زۆر هه ڵکه وتووی
ئیسلامیی هه ڵخستووه له لایه نه
جیاجیاکانی زانستدا ، ئه وه تا :

**له حه دیسدا :** گه وره ترین
ئیمامی حه دیث ویژه کانی تێدا

هه لکه وتووه ، که پێشه وا ( ابو عبد الله ی بوخاری ) یه (١٩٤ـ ٢٥٦هـ) هه روه ها پێشه وا (ترمذی) ش خه ڵکی هه مان وڵاته ..

**له ته فسیردا :** ( زمخشری ) خاوه نی ته فسیری ( الکشاف ) که له ساڵی (٤٦٧) ی کۆچی دا له دایكْ بووه، خه ڵکی دێی (زمخشر) بووه له ناوچه ی ( خواریزم ) .. ئه م زانایه زیاتر له (٥٠) کتێبی نووسیوه به تایبه ت له بواری جوگرافیادا ، که به داخه وه زۆربه یان ون بوون ..

**له پزیشکی‌دا :** ( ئه بو عه لی ئیبن سینا ) که له ساڵی (٣٧٠) کۆچی له دایكْ بووه له دێی ( ئه فشته ) ی نزیكْ شاری ( بوخارا ) و، خاوه نی گه وره ترین کتێبی پزیشکی یه ، که ( القانون فی الطب ) ه ..

**له بیرکاری دا :** ( خوارزمی ) ی تێدا هه ڵکه وتووه ، که وێنه ی ژماره عه ره بی یه کانی نووسی و، دۆزه ره وه ی لۆگاریتمیشه ..

**له فه له کدا :** ( الوكْ بێگْ ) که کوره زای ( ته یموری له نگْ )ه ، له ساڵه کانی ( ١٣٩٣ ـ ١٤٩٢ ) زایینی ژیاوه ، مه رصه دێکی فه له کیی گه وره ی دروست کردووه و، کاره کانی به گرنگترین کاری فه له کی داده نرێن پێش دۆزینه وه ی ته لسکۆب ..

**له فه لسه فه دا :** ( فارابی ) ی تێدا هه ڵکه وتووه ، که له شاری ( فاراب ) له دایكْ بووه و ، به ماموستای دووه م له دوای ( ئه رسطۆ ) ناسراوه .

**له زمانه وانی‌دا :** زانایه کی وه كْ ( بیرونی ) که له سه ده ی چواره می کۆچی‌دا ژیاوه ، له و وڵاته دا هه ڵکه وتووه .

وه چه ندین زاناو پێشه وای تر ..

**ئه مرۆی ئۆزبه کستان :**

له سه رده می (پیرسترۆیکا )دا ، له سالّی ۱۹۸۹ دا گۆڤاری SPUTNIK - که گۆڤارێکی سۆڤیه تی بوو، له ژێر ناونیشانی ( مانگرتنه په رستن ) دا باسی مانگرتنێکی گه وره ی موسڵمانه کان ده کات له شاری ( طاشقه ند )ی پایته خت .. که چۆن له ڕۆژی هه ینیی ۱۹۸۹/۲/۳ دا زیاتر له ( ۱۰.... ) نوێژخوێنی مزگه وتی ( طه لاّ شێخ ) دوای نوێژ به ره و ده زگا حکومی یه کان ده ڕۆن و ، شیعاری د ژ به ( موفتی ) ی سه ر به حکومه ت هه لّده گرن و ، داوا ده که ن که ( موفتی ) له لایه ن موسڵمانانه وه هه لّبژێررێت ، نه کۆ حکومه ت به ئاره زووی خۆی دیاریی بکات .



له ڕاستیدا ، جه نگی ئه ڤغانستانیش کاری کردووه ته سه ر ئه م ولاّته و ، موسڵمانانی وریا کردووه ته وه .. ئه وه بوو قافلّه سه ربازی یه کانی سۆڤیه تی جاران هه مووی به ناو شاری ( طاشقه ند ) دا تێده په ڕی بۆ ڕۆیشتن به ره و جه نگ له ئه ڤغانستان ..

هه رچه نده دوای وه رگرتنی سه ربه خۆیی هه ندێک گۆڕان له ڕوالّه تی ده ره وه ی ( ئۆزبه کستان)دا ڕوویدا ، به لاّم له ڕاستیدا هێشتا هه ر سه رکرده کۆمۆنیسته کانی جارانن که ده ستیان گرتووه به سه ر ولاّته که داو، له ئیش و فڕوفێلّی خۆیان نه که وتوون بۆ له ناوبردن و شتنه وه ی ناسنامه ی ئیسلامیی ئه و میلله ته ی که له وێدا ده ژین ..

ئه وه تا حكومه تی ئۆزبه كستان به ئاشكرا - به فڕۆكه و تۆپ و سوپا - یارمه تیی شیوعی یه كانی طاجیكستان ده دات بۆ سه ركوت‌كردنی موسڵمانه كان ..

به ڵام له گه ڵ ئه وه شدا هه ستی ئایینی هه ر ماوه و ، له م ساڵانه ی دواییدا به فشار بۆسه ر حكومه ت توانرا چه ند قوتابخانه یه كی

ئیسلامیی بكرێته وه بۆ دروست كردنه وه ی زانایان و وتاربێژانی ئیسلامی .. هه روه ها ده ست كراوه به گرنگی پێدان به ده ستنووسه كان كه ژماره یان له ( ۸۰۰۰ ) زیاتره ، له وانه ش كتێبی ( القانون فی الطب ) ی ابن سینا یه ..

وه چه نده ها كتێبی تریش كه ئه مڕۆ له هیچ شوێنێكی ڕۆژهه ڵات و ڕۆژئاوا و وڵاته ئیسلامی یه كانیشدا نه ماون ..

زیاتر له وه ش ئه مڕۆ پارتی **ڕاپه رینی ئیسلامی** - كه له گشت كۆماره ئیسلامی یه كانی سۆڤیه تی جاران دا هه یه - یه كێكه له پارته به هێزه كانی ئه و وڵاته و ، هه وڵ ده دات ببێته پارتێكی ڕه سمی و ، ململانێی حیزبی شیوعیی ئه و وڵاته ده كات .

**هه وڵی فێڵاوی " ئیسرائیل " :**

به ڕاستی ئه م وڵاته گرنگه ئیسلامی یانه چاوه ڕوانی وریابوونه وه ی زیاتریان لێ ده كرێت و - به یارمه تی خوا - له ئاینده یه كی نزیكدا هه موو ئه و فێڵ و پیلانه گڵاوانه ی كه كراون بۆ كوژاندنه وه و له ناوبردنی هه ستی ئیسلامی له و وڵاتانه دا پووچه ڵ ده بنه وه ..

وڵاتانی دژ به ئیسلامیش به گرنگیی ده وری ئه م كۆمارانه ی سۆڤیه تی جارانیان زانیوه له ئاینده ی بێداربوونه وه ی



ئیسلامیی گەلانی ناوچـــەدا ،
بۆیە ئەوەتا ئیسرائیل بەئاشکرا
دەیەویت لەم ولاتانـــــــە
نزیکئ بیتەوەو ، پەیوەنـــدیـی
پیشەسازی و ئابووری لەگەلیـان
دروست بکات و ، ئەوسا لـــــە
نزیکەوە چاودیری و دژایەتـــیی
ئەو بووژانەوەو راپەریـــــنە
ئیسلامییە بکات ..
بەلام ئیمەش ئەم وەعـــــدەی
خوایان بیر دەخەینەوە :

(( و لَقد کتَبنا فی الزّبور مِن بَعـد
الذِّکر أنّ الارضَ یَرثُها عبادیَ
الصّالِحون )) ئایەتی ۱۰۵ سورەتی
( الانبیاء ) .


سەرچاوەکـان :

۱ ـ گۆڤاری SPUTNIK
ئۆکتۆبەر ۱۹۹۰ .
۲ ـ گۆڤاری ( الفیصل ) /
ژمارە ۹۸ / سالی ۱۹۸۵ .
۳ ـ گۆڤاری ( العالم ) /
ژمارە ۹۷ / سالی ۱۹۸۵ .
ـ رۆژنامەی ( المسلمون ) /
ژمارە ٤٤٣ / سالی ۱۹۹۳ .


oooooooooooooooooooooooooooooo
oooooooooooooooooooooo
oooooooooooooo

# تازووە فریاکەوە

لەم بەشەدا :



**ئازیزان !**

سڵاوی پەروەردگاری مەزنتان لێ بێ

ئەوەی شایانی باسە زۆر کەس دەبینین کاتێ کە تووشی ئازارێک یا نەخۆشی یەک دەبن، بێ پەروا ئارامیان لێ هەڵدەگیرێ و هاناو هاوار دەبەن بۆ پزیشکێک یا دەرمانێک، یا شارەزایەک تا چارەسەریان بکات و، ئارامی و هێمنی بگێڕێتەوە بۆ لاشەیان ..

به لام .. به داخه وه ، كه م
كه س ده بينين له وانه ی كه تووشی
نه خۆشيی ده روونيی كوشنده بوون ..
بێ باكن و خۆيان به ته ندروست و
ساغ ده زانن .. له كاتێكدا كه
پزيشكێكی ئاسايی ، يا بگره
برينپێچێكیٔ له هه ڵسوكه وتياندا
نيشانه ی لاسه نگی و لاری و نه خۆشی
ده بينێ ..

جا بێگومان ئيماندارانی دڵسۆز
خۆيان به لێپرسراو ده زانن به رانبه ر
هه موو ده رده داران به گشتی و
برايانی ئيماندار به تايبه تی، وه حه ز-
ده كه ن و ئاواته خوازن كه سه ره تا
ئه وانه خۆيان بده نه به ر تيشكی
هه ندێ له ئايه ته كانی سوره تی
( حجرات ) .. دوای ئه وه به
پێوه ری ئه م فه رموودانه خۆيان
هه ڵسه نگينن :

(( المسلم من سلم المسلمون من
لسانه و يده )) .. (١)

(( لا يؤمن احدكم حتى يحب لاخيه
ما يحب لنفسه )) .. (٢)

(( .. بحسب امرىٔ من
الشر ان يحقر اخاه
المسلم )) .. (٣)

ئه وجا ده ڵێين : برای ئازيز !
نه خۆشی یه ده روونی یه كان
زۆر زۆر له نه خۆشی یه لاشه يی یه‌كان
سامناكترن .. به ڵكو نه خۆشی يه
لاشه يی یه كان زلله ی ميهره بانين ،
به تايبه ت كاتێ كه ئارام ده گرين و
خۆگر ده بين ده بنه هۆی سرينه وه ی
گوناهان و به رزبوونه وه ی پله و
پايه مان ..

به لام نه خۆشی یه ده روونی یه كان
وامان لێ ده كه ن كه ژيانی دنيا به
په ستی و غه مباری و ناره حه تی
به رينه سه ر .. له قيامه تيشدا له به ر-
-ده م دادگای خوايی دا شه رمه زار و
خه جاڵه ت ببين ..

جا ئه و كاته بۆمان ده رده كه وێ
كه چ كه تنێكمان به خۆمان كردووه و ،
چ په نێكمان به سه ر خۆمان هێناوه ..
قورئان ده رباره ی ئه و پێشهاته
ده فه رموێ :

(( فقدمنا الى ما عملوا من عمل
فجعلناه هباءً منثوراً )) الفرقان/٢٣

ئه و ڕۆژه هه ردوو ديو، واته نهێنی و
ئاشكرا ، ڕواڵه ت و ناوه ڕۆكیٔ ده كه ونه
ڕوو ( يوم تبلى السرائر ) ، تومه س
هه روه كو ئيمانداران دڵنيان : كه

فریشتەکان بەدەزگا پێشرەفتەکانیان هەموو هەڵسوکەوت و خەتەرەو خەیاڵ و رق و بوغز و کینەو.. هتد، هەر هەموویان تۆمار کردووە ..
ئیتر کەس ناتوانێ ملە ملێ بکاو، کەسیش ناتوانێ ئینکاری بکا ..
ئەوسا ئیتر کابرا دەبینێ بەکۆڵێ نوێژ و رۆژوو و زەکات و حەج و چاکەوە دەهێنرێ .. بەلام لەولاوە غەیبەت و بوختانی بۆ ئەم کردووە و، درۆی بەدەم ئەوەوە هەڵبەستووە و،کارەکانی بەشی نەفس و ئارەزووی تێکەڵ کردووە ..
رەخنەی بێ جێی لەم گرتووەو، تۆمەتی بۆ ئەو دروست کردووە ..
جا هەموو ئەو خەڵکەش دەورەی دەدەن و داوای مافی خۆیان دەکەن .. لەو رۆژەدا بەدەگمەن - مەگەر خوا بینێتە دڵیان - لەحەقی خۆیان خۆش دەبن .. ئەوسا ئیترقورپ بەسەرە چاکەکانی دەدرێ بەخاوەن مافەکان ئینجا کە چاکەی نەما - خۆ ئەو خەڵکە (معصوم - و بێ گوناه نین - گوناه و تاوانەکانیان دەدرێ بەسەر ئەودا و، تای تەرازووی شەری قورس دەبێ و، فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە - پەنابەخوا - .

**جا کەسەکەم !**

کاتێ کە ئاوا دڵنیاین لە سەرەنجامی نەخۆشی یە دەروونی یەکان توخوا حەق نی یە زوو فریای خۆمان بکەوین و چارەسەری بۆ بدۆزینەوە ؟!

ئایا ئەو جۆرە حاڵ و وەزعە سامناکتر نی یە لە نەخۆشی یە لاشەیی یەکان ؟ !

دەبا تا فرسەت ماوە ، تا نەخۆشی یەکە تەشەنەی نەکردووە .. ئێستا وەک هەلامەت دێتە بەرچاو ، تا دانەبەزیوەتە ناو قورگ و بۆرییەهەوا و نەبووەتە سیل و شێرپەنجە .. با فریای خۆمان بکەوین ، چونکە گوێ پێ نەدان و پشت گوێ خستن نەخۆشی یەکە سەخت تر دەکات ..

دەبا تا زووە و فرسەتەکە لەدەست نەچووە .. تا کاتمان بەدەستەوە ماوە و دێر نەبووە .. تاکاتی دیاریکراوی ژیانمان نەبووەتە سفر و دڵ لە لێدان نەکەوتووە .. با فریای خۆمان

بکه وین .. با توێشوو بۆ ئه و ڕۆژه بخه ین که قورئان له سه ر زمانی حه زره تی ئیبراهیم دا یادمان ده خاته وه کاتی که به سۆزه وه فه رموویه تی: (( و لا تُخزني يوم يبعثون . يوم لا ينفعُ مالٌ و لا بنون . إلاّ من اتى الله بقلبٍ سليم . )) / الشعراء ( ٨٧ ، ٨٨ ، ٨٩).

واته : په روه ردگارا ! خه جاڵه ت و شه رمه زاری ئه و ڕۆژه م مه که که زیندوو ده بنه وه . ئه و ڕۆژه ی که نه ماڵ فریام ده که وێ نه منداڵ.. مه گه ر ته نها ئه و که سه ی که به دیداری په روه ردگار شاد ده بێت ، به دڵێکی پڕ له ئیمان و سۆز و خۆشه ویستی و دوور له کینه وه ..

ده سا خوایه !

ئه و جۆره دڵانه زۆر بکه یت له ناوماندا ..

له شه ڕی نه فس و شه یتان و نه خۆشی یه ده روونی یه کان بمانپارێزیت ..

---

(١) رواه عبد الله بن عمرو بن عاص .
(٢) متفق عليه .
(٣) رواه مسلم و الترمذي .

ماموٚستا برهان محمد امين

## (١٠) ئامۆژگاری

١ - هه رکه گوێت له بانگ بوو له هه ر بارێکدا بووی زوو بڕۆ نوێژی خۆت بکه .

٢ - قورئان بخوێنه وه ، یا سه موتالای کتێبی ئیسلامی خۆت خه ریک بکه ، یا گوێ له شتی به که ڵک بگره ، یا یادی خوا بکه .. هیچ کاتێکت به بێ سوود نه به یته سه ر .

٣ - ڕه مزی هه ژیروباوه ڕیتک و ڕێبێنیک بکه که بونی کوفرو ئیلحادی خوازی لێوه بێت ..

٤ - له هیچ کاروبارێکدا خۆت به ده به ته قێ وه خه ریک مه که . چونکه ڕاکاری خێری لێوه نابینرێ ..

٥ - گاڵته و ده ست که مه ی زۆر مه که چونکه ته نه وه ی نێکوته ر به گاڵته و ئه ند ڕا نابوێرێ ..

٦ - ده نگی خۆت به رز مه که وه . چونکه ئازاردانی ئه وانی تری تیایه ..

٧ - له پاش مله باسی که س مه که و ، هه ستی هیچ لایه ک بریندار مه که و ، له مه ی خێروچاکه به ولاوه جێتر مه بێژه .

٨ - هه ر به کێکت له بواپانی خۆت نه ناسی بڕۆ خۆتی پێ بناسێنه ، چونکه بنچینه ی بانگه وازی ئیسلام خۆشه ویستی و یه کتر ناسینه .

٩ - زۆر پێ مه که نه ، چونکه ئه و دڵه ی به خوا به ستراوه ته وه هه میشه هێدی و هێمن و سه نگینه .

١٠ - کات که مه و ئه رک و ئیش زۆره ، تۆیه یارمه تیی ئه وانی تر بده بۆ ئه وه ی سوود له کاتی خۆیان ببینن و ئه گه ر ئیشێکت هه بوو درێژه ی پێ مه ده و ، زوو به جێی بگه یه نه .



# مامۆستا شێخ محمدی خاڵ

علامە

ژیان و بەرهەمە شاکارەکانی

**بەشی یەکەم**

ڕێبوار علی احمد

**سەرەتا :**

لە و باس و لێکۆڵینەوانەی کە دەربارەی مێژووی کورد و ئەدەبی کوردی کراون، دەردەکەوێت کە کوردستان بەر لە هاتنی ئیسلام هیچ جۆرە خوێندن و خوێندەواری یەکی تیادا نەبووە و، لە بواری ئەدەب و ڕۆشنبیریشدا شتێکی ئەوتۆ نی یە کە شیاوی باسکردن بێت .. تاوەکو لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی زایینیدا پرشنگ و ڕۆشنایی ئایینی پیرۆزی ئیسلام گەیشتە کوردستان، گەلی کورد بە دڵێکی فراوان و بەوپەڕی خۆشەویستی یەوە، باوەشیان کردووە بە ئالاکەیداو، خۆیان لە ژێر سروەو سێبەریدا حەساندۆتەوە ..

ئیتر لەو کاتەوە بەتەواوی خوێندن و نووسین و ئەدەب لەناو میللەتی کورددا سەری هەڵداوەو، بەسەدان لە کەڵە پیاوان وشاعیران و مێژوونووسان و ڕۆشنبیرانی تیادا هەڵکەوتووە و ناوبانگیان دەرکردووە، کە مایەی شانازی و شکۆداریی هەمیشەیین بۆمان .. (( وا دیارە بەهۆی ئایینی ئیسلام و پێویستی یەکانیەوە خوێندن و خوێندەواری بە

ناو کورددا بلاو بوونه وه .له وه ده کا هه ر له و سه رده مانه ش کوردستان مێژوونووسی به خۆیه وه بینیبێت ، به لام مێژوونووسه کانی به راستی که له و لێهاتوو بوون )) (١)

به لێ له دوای چه سپاندنی بنچینه کانی ئیسلام له کوردستاندا مزگه وت و حوجره کانی بوونه کانگا و کانیاوی زانیاری و، خه لکی له وێوه بیرو مێشکیان کراوه ته وه و، په یتا په یتا شیعرو سه رگوزشته و په ند و قسه ی نه سته ق سه ریان هه لداوه ، که ئه وانه ش سیما و ڕوخساری ژیانی نوێ بوون له و کاته دا ..

((ئه و به رهه مانه ی که له ئه ده بی فۆلکلۆردا هه مان، به هۆنراوه و چیرۆکێ و په ند و قسه ی نه سته قه وه زۆریان هی سه رده می کۆنمانه له گێجی ( ده وری ) ئیسلامیدا .

وه ده توانین دان به وه دا بنێین که ئه ده بی کوردی ـ به تایبه ت ـ له دوای هاتنی ئیسلام په خشانی هه بووه )) (٢)

هه روه کێ ده بینین که له شاعیرانی گه وره و هه ستیاره پێشینه کانی وه کێ مه لای جزیری و نالی و مه حوی و ئه حمه دی خانی و مه وله وی .. مه لای مزگه وت و مامۆستای ئایینی بوون و، زۆربه ی زۆری ڕۆشنبیر ـ ـ انمان له حوجره ی مزگه وته کاندا فێری خوێنده واری بوون و، هه ر له وێشه وه به هره یان وه رگرتووه و به رهه میان پێشکه ش کردووه ..

جا نه کێ هه ر له کاتی کۆندا، به لکو له م سه رده مانه یشدا مامۆستا و زانایانی ئیسلام پێشه نگێ بوون و، له زۆربه ی بواره کاندا ئه وان ڕچه یان شکاندووه و، بۆ یه که م جار به رهه می شاکاریان پێشکه ش کردووه .

یه کێکێ له وانه زانای گه وره (**شێخ محمدی خال**)ه ـ خوا لێی خۆش بێت ـ که بۆیه که م جار له مێژوودا فه رهه نگی (کوردی بۆ کوردی) ی نووسیوه و، خاوه نی ده یان به رهه می قه شه نگێ و شاکاریتره که هه ست و هۆشیاریی ئیسلامی پالنه رو هانده ری ڕاسته قینه ی بووه . هه روه کێ له مه ودوا تیشکێکێ ده خه ینه سه ر ژیان و به رهه مه کانی ..

**کورته یه کێ له ژیانی :**

شێخ محمدی خال کوڕی شێخ عه لی کوڕی حاجی شێخ ئه مینی کوڕی شێخ محمدی خاله .. زنجیره ی

نەژادیان لەو پەڕی شکۆمەندی ـ
ـ دایەو، هەر لە بنەچەوە بە
زانین و خواپەرستی ناسراون .. لە
ڕەگ و ڕیشەدا دەچنەوە سەر
عەللامەی بەناوبانگ (ابوبکری
مصنف) لێرەدا جێگەی خۆیەتی
لە کلاوڕۆشنەی ژیانی شێخی
خاڵەوە، ڕۆشنایی یەک بخەینە
سەر ژیاننامەی ئەو زاتە و
بزانین کێ بووە ؟

مەلا (ابوبکری مصنف)(٩٠٣ـ٩٩٤ک)
یەکێک بووە لە زاناکانی سەدەی
دەهەمی کۆچی، زۆر کاتی ژیانی
بە نووسین و کتێب دانان بەسەر
بردووە، بۆیە لە قەبی (مصنف)ی
بەسەردا بڕاوە ..

لە گرنگترین دانراوەکانی :

(١) (**طبقات الشافعية**) سەرچاوە ـ
ـ یەکی بە نرخە و بە زمانی عەرەبی
دانراوە، لە مێژووی ژیانی زانایانی
مەزهەبی شافیعی دەدوێت، لە
ساڵی ١٩٣٩ لە بەغدا چاپ کراوە ..

(٢) (الوضوح) ڕاقەیەکی ورد و
پڕ بایەخە لەسەر (منهاج)ی
ئیمامی نەوەوی، لە چوار بەرگی
گەورە دایە و، مێژووی نووسینی

دەگەڕێتەوە بۆ (٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر
هەتاکوئێستا دەستنووسە و لە
کتێبخانەکەی مامۆستا (خاڵ) دا
پارێزراوە ..

ئەم زاتە زانایەکی گەورە و
هەستیارێکی خاوەن بەهرە بووە و
شیعری بە زمانی کوردی و عەرەبی و
فارسی نووسیوە .. لە ساڵی (١٥٩٢ز)
چووەتە ماڵی خواو، لە وێ بەخزمەتی
زانای گەورە (ابن حجری عسقلانی)
گەیشتووە و، نزیکی حەوت ساڵ
ماوەتەوە و، بووەتە موفتیی حیجاز ..
لە پاشان گەڕاوەتەوە کوردستان و
بەردەوام سەرگەرمی وانەوتنەوە و
نووسین بووە، تاوەکو لە ساڵی
(١٥٨٥ ز) دا کۆچی دوایی کردووە و، لە
پاش خۆی چەند کوڕێکی لێ بەجێ ماوە
کە یەکێکیان (سید محمد) بووە و،
شێخی خاڵ بە (٩) پشت دەگاتەوە
سەر ئەو ..

بەڵێ شێخ محمدی خاڵ لە ساڵی
١٩٠٤ لە شاری سلێمانی، لە گەڕەکی
(گۆیژە) چاوی بە دنیا هەڵهێناوەو،
لە خێزانێکی خواپەرست و ئایین ـ
پەروەردا گۆش کراوە، سەرەتا لە لای
باوکی دەستی کردووەتە خوێندن،

تاوه کو له ته مه نی (٩) ساڵیدا باڕکـی ماڵئاوایی له دنیا کردووه ..
له وه و دوا له ئامێزی پڕ سـۆزی شێخ ئه مینی باپیره یـدا (١٨٤٤-١٩٣١ ز) نه‌ش و نمای کردووه و، لـه ده ریای پر ماریفه تی ئـه و خوانا سـه دا به هره مه ند بـووه و، هه ندێکێ له زانسته سه ره تایی یه کانی لا خوێندووه ..
شێخی خاڵ بۆ خۆی له م باره یـه وه ده ڵێت : (( باپیره م ( حاجی شێخ ئه مینی خاڵ ) که به منداڵی باوکم مردووه پێی خوێندووم، وه ده رسی پێ وتووم، وه ئامۆژگاریی کردووم به گوفتاری ره نگین و کرداری شیرینی خۆی )) [٣] ..
له پاشان زانسته شه رعی یه کانی تری له لای مامۆستا گه وره و ناوداره‌کانی ئه وکاته ته واوکردووه، که دیـار- - ترینیان ( شێخ عمری قه ره داغی ) و ( مامۆستا مه لا حسینی پیسکه ندی ) بووه، تاوه کو له ساڵی (١٩٢٨ز) دا به پله ی بالا ( ئیجازه ی عیلمـی ) ی له لای شێخ عومه ری قه ره داغـی وه رگرتووه و، له مزگه وتـه کـه ی خۆیاندا بووه ته ( موده ڕریـس) و وانه ی وتووه ته وه ..
له ساڵی ( ١٩٣٩ز ) بووه به قـازی و له شاره کانی سلێمانی و هه ڵه بجـه و چه‌مچه‌ماڵ و که رکووک و موصـڵ دا قازی یه تی کردووه و، ماوه ی (٢٨) ساڵ سه رکه وتووانه له و مه یدانه دا کـاری کردووه و، له ساڵی ١٩٦٧ داخانه‌نشین کراوه ..
له ساڵی ١٩٥٤ دا بووه ته ئه ندامـی کۆڕی زانیاریی عێراق و، له ساڵـی ١٩٧٠ شدا که کۆڕی زانیاریی کـوردی دامه زراوه کراوه به جێگری سه‌رۆک،له هه ردوو کۆڕدا شه ره فی ئه ندامی‌کارای کۆڕی پـێ به خشراوه ..
هه روه ها له ١٩٧٠/١٠/١ دا لـه هه ڵبژاردنی یه که م ده سته ی به ڕێوه به ریی لقی یه کێتیی‌نووسه‌رانی کورد له سلێمانی، مامۆستا خاڵ بـه سه رۆک هه ڵبژێرراوه، ئه ویـش زۆر دڵسۆزانه هه وڵی گه شه کردن و به‌ره‌و پێشه وه چوونی لقه که ی داوه و، جێ- ده ستی دیاربووه تیایدا ..
مامۆستا شێخ محمدی خاڵ لـه دوای ته واوکردنی زانسته شه رعی‌یه- - کان، به هه ستێکی ئیسلامی یـه وه ڕووی کردۆته توێژینه وه ی بابه تـه

ها وچه رخه کان و، خوێندنه وه ی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامه کانی ئه و کاته ..

هه ر له ڕێگه ی خوێندنه وه وه بیر و ڕاکانی ( جمال الدینی ئه ڤغانی ) و ( شێخ محمد عبده ) کاریان تێ - کردووه و ، گۆڕانکاری یه کی سه ر - - تاپایان له بیرو هۆشیدا دروست کردووه ، ئه وه تا شێخی خاڵ له باسی ده وری کاریگه ری ئه و گۆڤاره دا ( العروة الوثقیٰ ) که له ساڵی ( ١٨٨٤ز ) به زمانی عه ره بی ده رده چوو، (جمال الدین ) به ڕێوه به ری به رپرسیارو ( شێخ محمد عبده ) سه رنووسه ری بوو، ده ڵێت : (( .. له ماوه یه کی که مدا بیروباوه ڕی زۆر له خوێنده وارا ن و زانایان و دانایانی گۆڕی،زۆر نووستووی بێدار و مردووی زیندوو کرده وه ، که یه کێکیان زانای به ناوبانگ(سید رشید رضا) ی خاوه نی ته فسیرو گۆڤاری ( المنار ) ه ، وه یه کێکی تریان خۆمم ، که له ساڵی ١٩٣٢ دانه یه کم له هه موو ژماره کانی ( العروة الوثقیٰ ) ده ست که وت ، به خوێندنه وه ی په رده له سه ر دڵم لاچوو، وه له باریکه وه که وتمه باریکی تر)) (٤)

به ڵی نه ژادی ڕه سه ن و په روه رده ی باپیره ی و کاریگه ریی ماموستاکانی و بێداربوونه وه ی زوو- - به زووی شێخی خاڵ ، هه موو پێکه وه هۆکاری گه وره و گرنگ بوون له دروست بوونی که سایه تیی هوشیار و زانایی شێخ محمدی خاڵدا..

ئیتر له و کاته وه شێخی خاڵ بازووی مه ردانه ی لێ هه ڵماڵی و که وته خزمه ت کردن .. ته مه نێکی درێژی به خشی له و پێناوه دا و، چالاکانه هه وڵی دا و ، بووه ئه ستێره یه کی پرشنگدارله جیهانی ڕۆشنبیریی کوردی دا ..

له ته مه نی پڕ به ره که تیدا به ته فسیره نایابه که وه زیاتر له (٢٠) کتێبی چاپکراو و ( ٧ ) ی ده ست - نووسی به رهه م هێناوه .. ڕووپه ڕه کانی ( ژیان ) و ( ژین ) و ( گه لاوێژ ) و ( هیوا ) و ( ده فته ری کوردایه تی) و ( ڕۆژی نوێ ) و ( بلێسه ) و(سلێمانی)و ( به یان ) و ( زانکۆ ) و ( په روه رده و زانست ) و ( گۆڤاری کۆڕ ) و ... تاد شایه تی حاڵن و ، به چه ندین وتار و

باس و لیکۆڵینه وه ی به نرخـــــی
ئه ویان تیادایـــه ..

ماموستا شێخ محمدی خـــاڵ
له کۆتایی ساڵه کانی ژیانیدا سۆمای
چاوه کانی داهات و توانای بینینیان
نه ما ، ئیتر به ناچاری ده ستی لـه و
قه ڵه مه به کاره هه ڵگرت کــــه
(٥٦) ساڵی ره به ق له نیـــوان
په نجه کانیدابوو ، خزمه تی ئایین و
زمان و ئه ده ب و مـــیژوو و
که له پووری پێ ده کرد.. بـه ڵــێ
به یه کجاری وازی لێ هێناو ، چاوی
چاوه ڕوانیی برِی یه سۆزو به زه یـی
خوای میهره بان ، تا ئه وه بـــوو
له ڕۆژی هه ینیی ١٩٨٩/٧/١٤ دا دوا
ماڵ ئاوایی لێ کردین و، گـیانــه
خاوه نه که ی به ره و په روه ردگاری
گه ڕایه وه و ، لاشه که یشی به گــرد ی
سه یوان سپێررا.. خوای گه وره لێـی
خۆش بێت و به به هه شتی به رینـی
شاد بکات .. (٥)

ماموستا مه لا عبد الکریمی مدرس له
له لاواندنه وه ی شیخی خاڵدا ده ڵێت:

وه خته ده روونم گڕی تێ به ربێ
که ی ئیتر وێنه ی خاڵ ده سگیرئه بێ
هه رکه سێ بژی له سه ر حاڵی خاڵ
ناوی ئه مێنێ تا هه زاران ساڵ ..

---

**په راوێزه کان :**

(١) بروانه کتێبی ( مێژوو)/ د.که مال مه زهه ر ئه حمه د /ل١٠٠ ـ چاپی ١٩٨٣

(٢) ( ده قه کانی ئه ده بی کوردی ) / علاء الدین سجادی/ ل ٤١ ، ١٤٣ـ١٩٧٨

(٣) ناڵه ی ده روون/ شێخ محمدی خاڵ ج ١ / ل ٣ / ١٩٨٤ .

(٤) هه مان سه رچاوه / جزمی دووه م ل ١٨٠ / چاپی ١٩٨٥ .

(٥) سوپاسی به ده نگه وه هاتنـــی به ڕێز ماموستا ( خالد خـــاڵ) ده که ین ، که چه ند بابه تێکی خسته به ر ده ستمان له ژیاننامه ی شێخی خاڵدا سوودمان لێ بینی .. لــه به شه کانی تردا ئامازه یان بـــۆ ده کــه یـن ..

# هەواڵێک


مۆڵەت

پاش دەرچوونی یاسای ژمـــارە (١٠) ی ساڵی ١٩٩٣ ی چاپەمەنـــی کە دەسەڵات دەداتە وەزارەتـــی رۆشنبیریی هەرێم کە توانـــــای مۆڵەت دانی دەرکردنی گۆڤاری هەبە، گۆڤاری ( پەیامی ڕاستی ) مۆڵەتـــی ژمارە (٣) ی لە بەرواری ١١/٧/١٩٩٣ پێ درا.. بەم پێیە ئەم گۆڤـــارە بووە یەکەمین گۆڤاری مۆڵەت پێـــدراو و ڕەسمی لە نێوان گۆڤارەکانـــی کوردستانـــدا .

شایانی باسە کە یەکەمین ژمارەی ( پەیامی ڕاستی ) لە مانگـــــــــی ( شوبات ) ی ١٩٩٢ دا کەوتە پێش چاوی خوێنەران و ، تائێستاش (١٧) ژمـارەی لـــێ دەرچووە ..

بەم بۆنەیەوە هەمیشە و هەردەم سوپاسی بێ پایان بۆ خوای گـــەورە و بـــاڵادەست دووبارە دەکەینەوە و ، پیرۆزبایـــی بەردەوامیی دەرچوونـــی گۆڤـــارەکە ئاراستـــەی خوێنەران و پەیام دۆستان دەکەین .



ئامادە کردنی دایکی خەڵات

منداڵە خۆشەویستەکان ،

**جگەر گۆشەکانی پەیام !**

هیوادارین هەموو کاتێکتان پڕ خێر بێت وا ئەم جارەش چاوەگەشەکانتان بە گۆشەکەتان گەشەدارتر دەبێت بە هیوای ئەوەی کە ئەم گۆشەیە ڕێ نیشاندەری ژیانتان بێت و هۆی پەرەسەندنی زانیاریتان بێت ، جێگەی هەست و ڕا دەربڕینتان بێت .

**ئازیزان!** گۆشەکەتان باخێکە و جۆرەها درەختی بەرداری تیایە ، ئێوەیش بەگەردن ئازایی یەوە دەستی بۆ بەرن و تام و چێژی لێ وەرگرن . لەبیریشتان نەچێ کە خزمەت کردنی ئەو باخە لە ئەستۆی ئێوەی ئازیزدایە ، دەی وەرن با بەیەکەوە بکەوینە نەمام ناشتن و بژارکردن و ئاودانی ئەو باخە هەتا لە پاشەڕۆژدا پشت بە خوا لەبەروبوومی بخۆین .

# ڕه‌وشتی یاری کرده

منداڵم ، من منداڵـــم  بە چە کئ وچە قۆ ومقە س
یاری دە کە م لە مـاڵـم  یا ریی نا کە م لە گەڵ کە س
یاریی نا و منداڵ بـاوە  پاڵ وجوێن وشە ڕکـردن
ڕێگە یشی پێ درا وە  دوورن لە ڕە وشتی مــن
لە کا تی یا ری کـــردن  بە قیژە و ناڵە وگریـــان
نیمە درۆ و گزی کـردن  هیچ کە س نا کە م هە راسان
هیچ کا تێ گاڵتە نا کە م  هە ڵمە ت وشا ڵاوبــرد ن
بە خوشکئ یا  بە براکە م  ڕە وشتی نا پە سە نــدن

ها وڕێکە م وەکئ  بــرامــە
گشت کا ت ڕێزی لە لامــە

خە نــە طــە

## نیشتمانم جوانه

ئه م نیشتمانه جوانـــه
نه خشی ده ستی یه زدانه
که ردوونێکی فـــراوان
ئه ستێره و زه وی وئاسمان
به فری زۆر سپیی زستـان
داده پۆشی کێوه کـــان
شنه ی شه ماڵی بـه هـار
باخچه ی پڕگوڵ وگوڵـزار

با بزانین ئه م زینــــه
سروشتێکی ڕه نگیـــنه
خوا به خشیویه تی پێمان
تاقیکدیه بۆ هه مــووان
با سوپاسی کـــردگـــار
بکه ینه ویردی سه رزار

(ئاکۆ محمد فقێ صابر)

# نامەی جگەرگۆشەکان

کاکە زەید نەوزەر عەلــــی ، پۆلی یەکەمی ناوەندی-هەڵەبجەی شەهید ! دەست و پەنجەت خۆش بێت بۆ ئەو نامە ڕازاوەیەی بــۆت ناردووین ، وە داوات کردووە کە ببیت بە هاوڕێمان .. بە شانازی یەوە نـاوت تۆمارکرا لە لیستی هاوڕێیانـــــی گۆشەکەدا . ئیتر سوپاس بە هیواین نامەمـــان لـــێ نە بـــڕیت .

هەردوو خوشکی ئازیزمان دادە کۆچەر و زینب علی احمد لــــە نامەیەکیاندا دەڵێن :

یەک و دوو خوایەکە و نابێ بە دوو
سێ و چوار پەنا بە خوا هەزارجار
پێنج و شەش بمرێ شەیتانی ڕووڕەش
حەوت وهەشت خوایە بمخەیتــــە
بـــە هـــە شت
نۆ و دە یارمەتی هاوڕێت بــدە .

جگەرگۆشەی ئازیزمان ســالار عبدالله شریف لە بـرایەتـــی چیرۆکێکی خۆشی بۆ ڕەوانە کردووین لە ژێر ناونیشانی(پۆستەچیی شەیتان) زۆر سوپاسی دەکەین ، بە هیوایـــن نامەمان لێ نەبڕی و، پشت بە خـــوا ســوود لە چیرۆکەکەی وەردەگرین .

کاکە ســەربەست عثمان پــۆلـی شەشەمی سەرەتایی ، پارچە شیعرێکی بۆ ناردووین بە ناوی ( تێکۆشان ) تیایدا دەڵێ :

هەتا دەتوانی پاک وبێگەرد بە
بۆخزمەتی دین چالاک وەرد بە
تێکۆشان بۆ دین هەم بۆ نیشتمان
سەربەرزت دەکا لە هەردوو جیهان

خۆشەویستمان موهەیب کەمال لە قوتابخانەی عەربەت دەڵێ:

هەتا لە دونیا ماوم
قورئانە نووری چـــاوم
قورئانە هێزی ئەژنۆم
ڕووناکی بە ویێی دەروم

هەردوو جگەرگۆشەی خۆشەویست ڕێباز هادی - پۆلی چوارەمی سەرەتایی وە ڕێزان جمال پۆلی یەکەمی ناوەندی، دەستتان خۆش بێت بۆ ئەو چیرۆکە کاریکاتێری یەی بۆتان ناردووین، پشت بە خوا لە کاتی خۆیدا سوودی لـــێ وەردەگریـــن .



# کۆترێک و پەرداخێک ئاو

ڕۆژێکیان کۆترێک زۆری تینو بوو .. لە کاتێکدا بە ئاسمانەوە ئەفڕی بەدوای ئاودا ئەگەڕا ، چاوی کەوت بە پەرداخێک ئاو لەسەر تابلۆیەک وێنەی کێشرابوو ، ئەوەندە لێی وورد نەبووەوە تا بزانێ کە ئاوی ڕاستیە یان وێنەی پەرداخی ئاوە بەپەلە ڕووی تێکرد بەرەو پەرداخەکە بڕوات، بەڵام لە پڕ کێشای بە تابلۆکەدا و باڵێکی شکا و کەوتە سەر زەوی و لە جووڵە کەوت ، هەتا ڕێبوارێک گرتی و بردی ..

جا خۆشەویستان کۆترەکە ئازادی خۆی لەدەست دا ، ئینجا خۆی بە خۆی ئەوت :

پێویستە هەوڵدانمان بۆ گەیشتن بە ئاوات وامان لێ نەکات کوێر بین و مەترسی ڕێگامان نەبینین .. !



## تا ژمارەیەکی تر

## خواتان لەگەڵ

ئازیزان !

بەم زووانە چاوتان بەم چیرۆکە ڕوون دەبنەوە ..





إنا لله وإنا إليه راجعون

# پرسه‌نامه

به بۆنه ی وه فاتی میوانی خۆشه ویستمان

زانای پایه به رز و نووسه روو ئه دیبی گه وره ی جیهانی ئیسلام، به ڕێز دکـــتـــۆر (عادل عبد الله) به کاره ساتی ئۆتۆمبیل له به رواری ١٩٩٣/٧/٢٤ پرسه و دلدانه وه ی خۆمان وکه س وکاری وگشت موسلمانان ده که ین..

شایانی باسه ماموستای به ڕێز:

* سالی ١٩٤٦ له (زوبێر)ی سه ر به پارێزگای(به صره)، له خێزانێکی موسلمانی چاکه وبست داله دایک بووه، هه رله وێ گه وره بووه و خوێندنی ده ست پێ کردووه.
* به کالۆریۆسی زانستی له زانکۆی به غدا وه رگرتووه و، پاشان ماجستێر و دکتۆرا له (غیزیا) دا له (بریطانیا)، ماموستای زانکۆ بووه له (امارات).
* نه تنها به و بڕوانامه ی دکتۆرایه رازی نه بوو، بۆیه بڕوانامه ی ماجستێری له زانستی (أصول) دا وه رگرت.
* خوالێخۆش بوو ملی دانه نه واند بۆ سته م و زۆری ڕژێم، بۆیه له زیاتر له بیست سال له مه وبه ره وه عیراقی به جێ هێشت.. هه ر له و ساته وه به ئاواره یی، به بانگه واز و زانست داکۆکی ده کرد له ڕێی خوا و له ڕاستی و، به کتێب و نووسینه کانی خزمه تی گه ل و ولاته که ی و هه زارانی ده کرد.. چه ندین کتێب و باس و لێکۆڵینه وه ی هه یه، وه ک له گۆڤاری (الاصلاح) و ڕۆژنامه ی (دارالسلام) و نامیلکه کانی (المعین) دا.
* دوا جێگه ی سه رزه وی کوردستانی برینداربوو، هاتبوو بۆ زانینی حه وال و باری ژیانی خه لکه که ی، تا وێنه ی به ڕێته وه بۆ موسلمانانی جیهان و خێرخوازان بۆ درێژکردنی ده ستی کۆمه ک و یارمه تی بۆیان..

سه ره نجام له ڕۆژی ١٩٩٣/٧/٢٤ دا به کاره ساتێکی دلته زێنی سه یاره له ڕێی سلێمانی - هه ولێر دا گیانی پاکی له ده ست دا. هه ر له سلێمانیش به خاک سپێردرا. خوا لێی خۆش بێ و به به هه شتی به رینی شاد بکات.

کۆمه له ی نووسه رانی ئیسلامی کوردستان




# زمان خۆکردە یا خواکرد؟

ماموستا : یوسف شریف

ماموستای کولیجی ئـــــاداب

زانکوی صلاح الــدین

زمان یە کێکە لە و دیاردە ئاڵۆزانە ی کە تا ئێستا بۆ زمانە وانـــــان و ڕووناکبیران ساغ نە بووە تە وە ، چونکە کێشە ی چۆنیە تیی پە یداهوونـــــی زمان لە مێژوویە کی زۆر کۆنە وە سە رنجی زمانە وانانی ڕاکێشاوە ..

زمانە وانە کان دان بە و ڕاستی یە دا دە نێن کە زانیاری یان دە ربـــــارەی دروست بوونـــی زمان زۆر کە مە .. تا ئێستا هیچ تیۆرێکی سە لمێنـــــراو دە ربارە ی دیاردە ی زمان پێشکە ش نە کراوە .. زۆربە ی ئە و هە وڵانە ی کە دراون لە م بارە یە وە بریتی یە لە بۆچوونی تاکە کە سی و بیری ســــادەی نە سە لماو ، کە ئە مە ش دە گە ڕێتە وە بۆ چە ند هۆیە ک .. لە وانـە :

١ ـــ پە یدابوونی مرۆڤ لە خۆیدا لە پڕ بووە ، هە ر وە ک پە یدابوونـــــی زمانیش هە ر لـە پڕ بووە .

٢ ـــ پاش پە یدابوونی زمانە کانی ئە و سە ردە مە مە ڵبە ندی زمـــــان لە ناوچووە بێ ئە وە ی پاشماوە یە کی ئە وتۆ بە جێ بهێڵی بـــە هــــۆی دانە هاتنی نووســـــنە وە .. (١)

٣ ــ پاشماوەی ناڕاستە وخۆش نەبووە کە بیرێکی لێ بکرێتەوە دەربارەی پەیدابوونی زمان .
٤ ــ پشت بەستن بەو لێکۆڵینەـ ـوانەی کە لە سەر زمانی منداڵان و نەخۆشی یەکانی گوتن کراوە ، ئەوەندەی تر گریمانەکانی کرچ و کاڵ کردووە کە وەک بیرکردنەوە سەیر بکرێت نەک تیۆر .

لێرەدا چەند گریمان (احتمال)ێک دەخەینە بەرچاو پێش ئەوەی بیسەلمێنین کە زمان خواکردە .. بۆ ئەوەی لە ڕاستیی ئەم بیرە سادانە بگەین کە دەربارەی زمان دانراون :

(١)ــ گریمانەی دەنگە سروشتی یەکان:

بە پێی ئەم گریمانەیە زمان لە دەنگە سروشتی یەکانەوە دروست بووە ، واتە دانە دەنگی‌یەکان بوونە تەناو بۆ کەل و پەل و گیانلەبەرانی دەوروبەری مرۆڤ .. ئەم گریمانەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چوار و پێنجی پێش زایین ، واتە لە بیرەکانی ( ئەفلاتون ) و ( دیمکرتیەس ) دا هەبووە .. لە سەدەی حەڤدە و هەژدەدا لە بەر نەبوونی گریمانەی چەسپاو لەلایەن ( لایبینز ) ەوە پشتگیریی کراوە .. لە سەدەی نۆزدەشدا هەر لایەنگیری خۆی هەبووە ، وەک ( وتنی )و(داروین) ، ئەم گریمانەیە کە موکورتی یەکی زۆری تێدا بەدی دەکرێت ، لەوانە :

(١) ئەگەر زمان لە وشەی سادەی وەک لاسایی سروشت هاتبێ ، ئەم ڕۆنانە ئاڵۆزەی لە کوێ هێناوە ؟
(٢) بۆچی دەبێ وشەی زمانەکان هەموو وەک یەک نەبن ، کە دەنگە سروشتی یەکان هەموو یەکن ؟

(٢)ــ گریمانەی بانگ وقیژەی هەست دەربڕ The Pooh-Pooh Theory :

ئەم گریمانەیە لە سەدەی نۆزدەدا لە لایەن زانای ئەڵمانی 'شتاینتال' و دەستەیەکی تری زانایان خرایە بەردەست ، کە باوەڕیان وابوو زمان لە و دەنگە غەریزی یانە پەیدا بووە کە مرۆڤ بۆ دەربڕینی خۆشی و ناخۆشی و ئازار و پەستی بەکاری دەهێنێ .. ئەم گریمانەیەش بەهەمان ڕەخنەکانی پێشوو بەرپەرچ دەدرێتەوە .. (٢)

(٣) ـ گریمانه ی بزاوتن :

Gesture Theory :

هه ندێ زمانه وان لەوباوەڕەدان که سه ر له قاندن و ده ست جووڵاندن زۆر پێش قسه کردن هاتووه تـــه کایه وه .. به ڵگه شیان زۆریی ئـه و جووڵانه وانه یه که له ناو مرۆڤـه ساده کاندا ده بینرێت .. زانایـــان ( فۆنت ) ی ئه ڵمانی و ( مـــاری ) ی ڕووسی پشتگیریی ئه م بۆچوونـــه ده که ن و ده ڵێن : له یه کتــــر گه یشتن له بنه ڕه تدا له شێـــوه ی بزاوتن دا بووه ، ئنجا بووه به زمانی ئاسایی .. ئه م گریمانه یــــه ش دیسانه وه ده درێته وه به ر ڕه خنه و که موکورتیی به وه ده ستنیشـــان ده کرێت که له تاریکی دا کارناکات .. واته ئه و مرۆڤانه بـــــه شه و په یوه ندی یان نه بووه .. هه روه هـا له کاتی بوونی کۆسپ دا سوودی نی یه سه ره ڕای ڕه خنه کانی پێشوو که له گریمانه ی یه که م و دووه م گیراوه .

(٤) ـ گریمانه ی مۆسیقا

The Musical Theory

به پێی ئه و گریمانه یه زمـــان له گۆرانی یه وه هاتووه ، یــــــان هه ردوکیان له یه ک بنچینــــــه وه دروست بوون . سه ره تا زمانی مــرۆڤ بریتی بووه له گۆرانی یه کی بێ وشـه[٣] واته(هه ر ئاواز) ، که ته نیا بۆمه به ستی هه ست ده ربرین بووه ، بۆ تێگه یشتن و په یوه ندی کردن نه بووه .. ئینجـــا گۆڕاوه بۆ وشه ی درێژی پڕله ده نگـی قورس و چه ناگه شکێن .. ئــــــه م گریمانه یه ش له لایه ن ( یسپرسن )ه وه خرایه ڕوو.. شایانی تێبینی یه کـــه ئه م گریمانه یه سه ره ڕای ڕه خنه کانی پێشوو ڕه خنه یه کی تری لێ ده گیرێ که ته نانه ت مرۆڤی ساکاریش قه ناعه ت به م گریمانه یه ناهێنێت نه ک زمانـه وان چونکه له بنچینه یه کی خه یاڵـــــه وه دروست بووه ، نه ک زه مینه یــــه کی عه قڵی یان فیکری .

(٥) ـ گریمانه ی په یوه ندی :

The Contact Theory

دوا گریمانه ، که له م ساڵانــــه ی دواییدا به رچاو ده که وێت ،گریمانـه ی په یوه ندی کردنه که له لایه ن(ڕیفز)ه وه خراوه ته ڕوو.. به بۆچوونی ئه و زمان له ئه نجامی ئه م غه ریزه به تینـــه وه دروست ده بێ که له مرۆڤدا هه بـــووه بۆ په یوه نـدی کردن .. ئه م غه ریزه یه ش

بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە.. قۆناغی قیژە، قۆناغی بانگکردن، قۆناغی وشە، بەکارهێنانی دەنگەکان وەک هێما،کە ئەمەش هەر لە توانای مرۆڤدایە (٤)..

لە ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوانە ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە کە تا ئێستا بیردۆزێک دەربارەی دروست- بوونی زمان نەخراوەتەڕوو.. ئەوەی بەرچاو دەکەوێت هەموو گریمانەن. لە هەندێ لەو گریمانانە بۆچوونێک و ئاماژەیەک بەدی دەکرێت کە زمان خۆکرد نەبێ وەک ئەوەی لە دوا گریمانەدا خستمانەڕوو کە باس لە غەریزە دەکات.. لێکۆڵینەوە نوێکانیش هەموو دان بەوەدا دەنێن کە تەنیا مرۆڤ توانای قسەکردنی هەیە.. (سوسیر) و (چۆمسکی)ش(٥) ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن کە مرۆڤ کاتێ لە دایک دەبێ توانای فێربوونی زمانی تێدایە کە لە گیانداری تردا نییە.. ئەو تاقیکردنەوانەی کە لەسەر ئاژەڵەکانیش کراوە تا ئێستا هیچیان ئەوەیان نەسەلماندووە کە لە توانای هیچ ئاژەڵێکدا هەبێت فێری زمانی مرۆڤ ببێ، تەنیا فێر- بوون لە چوارچێوەی چەند وشەیەک و ڕستەیەک تێپەڕ نەبووە..(٦) کەواتە زمان دیاریی خوایە بۆ مرۆڤ.. ئەم دیارییەش لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا دەبینرێ.. بۆ ئەوەی لە ڕاستیی زمان بگەین و، بزانین کە ژیان هەرگیز بێ زمان نابێت، چەند نموونە و بەڵگەیەک بۆ سەلماندنی دەهێنینەوە لە چوارچێوەی وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێک، دەبێ کێ زمانی دانابێ؟

خوای گەورە کە بوونەوەری دروست کردووە، زمانیشی پێ بەخشیوە، هەر بەو زمانەش دەیخاتە بەر پرسیار لە کردەوە و هەڵسوکەوتی.. لێرەدا چەند ئایەتێک وەکو بەڵگە دەهێنینەوە..

خوای پەروەردگار لە وێنەی بەر- پرسیاریی بوونەوەر لە ڕۆژی دواییدا دەفەرموێت: (( و قالوا لِجلودهم لِمَ شهدتم علينا قالوا انطقَنا اللّهُ الذى انطقَ كلّ شَئٍ و هو خَلَقكم أولّ مَرةٍ و اليه ترجعون )) ٢١/ فصّلت .. واتە هەموو دروستکراوێک خوا دەیخاتە قسە.. ئەم بۆچوونە لە سەردەمی یۆنانییەکانەوە باو بووە. زاناکانیان بۆنموونە (( هیراکلیت )) دان بەوەدا دەنێ کە خوا زمانی بە

مرۆڤ به خشیوه ، چونکه مرۆڤ ده سه لاتی ئه وه ی نی یه ده ست نیشانی خالی سفری ده ست پێکردنی ده وروبه ری خۆی بکات.. هه روه ها ده سه لاتی ئه وه شی نی یه زمانێک بۆخۆی دابنێ که له مه وبه ر هیچ بنج و بنه مایه کی نه بووه .لۆجیک ده لێ : هه رگیز مرۆڤ ناتوانێ بالّه خانه یه ک یا خانوویه کی بچووک به بێ بناغه له سه ر هه وا دروست بکات ، تا بنچینه یه کی نه بێ.. که بنچینه و بناغه که بووگه شه پێکردنی زۆر ئاسانه ، چونکه خوای گه وره عه قلّی به مرۆڤ به خشیوه و توانای فێربوونی زمانیشی پێ به خشیوه.. هه روه ک زانا زمانه وانه کان دان به و راستی یه دا ده نێن.. بۆ نموونه ( فردیناند دی سۆسێر ) له کتێبه - که یدا (7) ده لێت : مرۆڤ هۆیه کانی فێربوونی زمانی له گه لّدا له دایک ده بێ.. ئه وبه هره یه ی که له مرۆڤدا هه یه له هیچ ئاژه لێکی تردا به م شێوه یه نی یه.. خوای میهره بان توانای هه ولّدانی داوه به مرۆڤ به لام ویستی هه لّبژاردنی نه داوه تێ هه روه ک ده فه رموێت : (( لیس لک من الامر من شئ ))/١٢٨ آل‌عمران .

به لّگه یه کی تری لۆجیکی له وه دایه که هیچ ئه ندازیارێک یا وه ستایه ک رێگای ئه وه نادات که کاره که ی یا ده ستکرده که ی که موکورتیی تێدا هه بێ جا چۆن خوای گه وره که ده فه رموێت: (( لقد خلقنا الانسان فی احسن تقویم )) / التین - ٤ . به وه رازی ده بێت ئه و باشترین خولّقاوه بێ زمان به جێ بهێلّێ.؟ئه و که موکووری یه ی بداتێ که په له قاژێ بکات بۆ ئه وه ی زمانێک بۆ خۆی بدۆزێته وه یا دروست بکات ؟ئه ی له سوره ی ( ذاریات ٥٦ )دا نافه رموێت : (( و ما خلقت الجن و الانس الا لیعبدون )) .. خۆ ده بێت عیباده ت به قسه و جوولّه بێت ئه گینا چۆن عیباده ت ده کرێت ؟ هه روه ها له ( الاسراء - ٤٤) دا ده فه رموێت :

( تسبّح له السماوات السّبع و الأرض و من فیهنّ و ان من شئ الا یسبّح بحمده و لکن لا تفقهون تسبیحهم انه کان حلیماً غفوراً )) . ئێمه له زمانی زینده وه ره کانی تر ناگه ین چونکه خوای په روه ردگار ئه و به هره یه ی پێ نه داوین .. لێره دا پرسیارێک دێته کایه وه ، ئه ویش ئه وه یه که خوا

زمانی به خه لات داوه به مرۆڤ، هه ر وه ک ده فه رموێ :(( و علـم آدم الاسماء كلها ثم عرضهم على الملائكة فقال أنبئوني بأسماء هؤلاء ان كنتم صادقين )) / ٣١ البقرة ) . ده بێ ئه و زمانه چۆن بێ و زمانی یه کهم چۆن بوو بێت ؟ بۆ وه لام دانه وه ی ئه م پرسیاره ده لێین :

١ ـ تا ئێستا زانست به هیچ شێوه یه ک نه گه یشتۆته پله یه ک که ده ستنیشانی زمانی یه کهم بکات چونکه زمانه وانه کان هه ر خۆیان دان به وه دا ده نێن که زانستی ئیتمۆلۆجی[٨] زانستێکه به ره نگاری شاخێکی به رز ده بێت له قۆناغێکدا ئیتر هه ره س دێنێ، چونکه له سێ هه زار سالدا زمان به ته واوی ده گۆرێ و به هیچ شێوه یه ک ره گه زه که ی نادۆزرێته وه .. ئه م دیارده یه ش به سه ر هه موو زمانه کاندا پیاده ده کرێت ..

٢ ـ کۆمه له ی زمانه وانیی پاریس له یه کهم ده ستووریدا سالی ١٨٩٩ بریاری دا به هیچ شێوه یه ک لێکۆلینه وه له سه رئه و باسانه نه که ن که ده رباره ی ره گه زی زمان نووسراون هه روه ها یه کێک له زمانه وانه کان[٩] ده لێت : گه ران بۆ زمانی ره سه ن له چوارچێوه ی زمانی مندالان و زمانی گه له سه ره تایی یه کان کارێکی بێ سوودو بێ ئه نجامه ..

که واته ئێمه هه رگیز ناتوانین زمانی یه کهم بدۆزینه وه ، ئه و هه ولانه ی که دراون و ده درێن ئه نجامی به سوود ناده ن به ده سته وه ، چونکه خوای گه وره له قورئانی پیرۆزدا ئاماژه بۆ جیاوازیی ره گه زو زمانی مرۆڤ ده کات و ده فه رموێت : (( ومن آياته خلق السماوات والأرض واختلاف ألسنتكم وألوانكم ان في ذلك لايات للعالمين)) ٢٢ روم واته خوا ده زانێ ئه و زمانه ی که فێری ئاده می کردووه لق و شێوه و زمانی تری لێ دروست ده بێ ، هه روه ک چۆن نه وه یه ک دێت و نه وه یه ک ده روات .. هه ر به م شێوه یه ش زمانێک دێت و زمانێکی تر جێگه ی ده گرێته وه به م جۆره هه رگیز ناتوانرێت ده ستنیشانی زمانی یه کهم بکرێت ..

جا بۆ ئه وه ی زانیاریی ته واومان هه بێ ده رباره ی ئه و هه ولانه ی دراون بۆ زانینی زمانی یه کهم له به شی دووه مدا ـ پشت به خوا ـ چه ند تاقیکردنه وه و بۆچوونێکتان بۆ ده خه ینه روو ، تا بتوانین ساکاری و ساده یی ئه و گریمانانه ی بۆ ئه م مه به سته دانراون ، ده ربخه ین .

## په راویزه کان :

١ ـ موحه ممه د مه عروف ،
زمانه وانی / ل ٨
٢ ـ بروانه "لغات البشر" ،
ماریوپای / ل ١٨
٣ ـ زمانه وانی / ل ٩
٤ ـ هه روه ها .
٥ ـ دوو زمانه وانی سه ده ی بیسته من ، که ده وریکی گرنگیان هه یه له گه شه و لیکولینه وه ی زماندا .
٦ـ "اضواء على الدراسات اللغوية المعاصرة" / ل ١٥٢ .
٧ ـ له کتیبه که یدا که له ژیر ناونیشانی ( چه ند به شیک له زمانه وانی گشتی ) دایه ، دان به و راستی یه دا ده نیت .
٨ ـ واته گه ران به دوای وشه ی بنه ره ت و، ره سه نی وشه دا .
٩ ـ " فاندریس " له کتیبه که یدا ( زمان ) پشتگیری له بریاره که ی کومه له ی زمانه وانیی ( پاریس ) ده کات و، داکوکی له سه ر مانه وه ی بریاره که ده کات .


● ● ● ● ● ●

## وه لامیکی تایبه تی

پاش ئه وه ی که له ژماره (١٥) ی ( په یامی راستی ) دا به بونه ی تیپه ربوونی (٥) سال به سه ر ده ستگیر کردنی خوشه ویستمان ( ماموستا ابوبکر عزیز) دا سکالا ـ یه کیمان بلاوکرده وه ، که له شه وی ده ستگیرکردنیدا نووسیبووی .. برای به ریز کاک ( محمود حاجي واحد کوکویی) له هه له بجه ی شه هیده وه نامه یه کی پرسوزی بو ناردووین ، که تیایدا چه ند بیره وه ری و بینینیکی خوی نووسیوه له گه ل ماموستادا له ناو زینداندا که هه موویان باسی خوانانی و خو ـ راگری و باش ره فتارکردنی ماموستا ده که ن .. وه چون وه کو ماموستایه کی دلسوز و باوکیکی به وه فا و برایه کی راسته قینه وابووه بویان و زور دلخوشیی داونه ته وه ..

ئیمه ده سته ی نووسه ران و کار ـ گیرانی گوقاره که ش زور سوپاسی به ریز کاک محمود ده که ین و هیواداریین که چی تر ده زانی ده رباره ی ماموستا بومان بنووسیت .. وه نزامان لای خوای گه وره ئه وه یه به زووترین کات ماموستا بگه ریته وه ناو که س و کارو دوست و برادہ رانی .

په یامی راستی

# سەرنجێک لە ڕەوانبێژی و کورتبڕی قورئانی پیرۆز

محمود احمد محمد
بەڕێوەبەری کتێبخانەی
ئەوقافی مەرکەزی لە سلێمانی

**شوێنێکێ لە و شوێنانە ی قورئانی پیرۆز ئەوپەڕی کورتبڕی و خۆشخوانی و ڕەوانبێژی و سەرئاسایی تێدا کردووە ، باس و خواسی تۆفانی حەزرەتی ( نوح ) ە - سەلامی خوای لێبێ - .. ئەگەر بەوردی ئەو ئایەتانەی باسی ئەم ڕووداوە دەکەن بخوێنینەوە و ، سەیری جوانیی داڕشتن و کێش و تابلۆی پێویستیان بکەین و گوێ لە ئاواز و مۆسیقایان بگرین ، دەبینین بەکەمترین وشە و ڕستە جوانترین و ڕەوانترین مانایان بەخشیوە .. !**

دەبا پێکەوە سەرنجێکی وردبینانە لە قورئان بدەین و، بزانین بەچ شێوەیەکێ باسی نیشتنەوەی تۆفانەکە دەکات و ، بەچ داڕشتنێکی ڕەوان و ڕستەیەکی هەستهەژێن و بەرز کۆتایی تابلۆکە دەکێشێ ، کە دەفەرموێ :

(( و قيل يا ارض ابلعي ماءكِ و يا سماءُ اقلعي . و غيض الماءُ و قُضي الأمر و استوت على الجوديّ و قيل بُعداً للقوم الظالمين )) هود / ٤٤

لەم ئایەتە پیرۆزەدا قورئان بەکورتترین ڕستە و ڕەوانترین قسە باسی کۆتایی هاتنی تۆفانی حەزرەتی ( نوح ) دەکا - سەلامی خوای لێبێ - هەر بەبیستنی وشەکان مرۆڤ هەست دەکا بەڕەوانی و بێگرێ و گۆڵی و صاف و ( سَلِس )یی دەقەکە .. هەر دەڵێی ئاوی صاف و بێگەردە بەئەسپایی دەکشێ ، بەئاواز و مۆسیقای تایبەتی و خۆش مرۆڤ دەمارشێل دەکا .. هێندە ڕەوان و شەکرامێزە مانا و ناوەرۆکی پێش وشە و ڕستە لە دڵدا جێگیر دەبن و ، وشە و ڕستەی پێشبڕکێی مانا و

ناوه رۆکێ ده ده نه وه و ، جێی خۆیان له میحرابی دڵدا ده که نه وه ..!

چۆن ده بێ وا نه بێ ؟! ئه مه دارشتنی په روه ردگاره و ، شاکاری زاتی بێچوونه و، که لامی خودایه ..!

خوێنه ری ئازیز !

بڕوانه ڕیزبوونی ڕسته کانی ئه م ئایه ته چۆن به هۆی پیتی ( واو ) ی عه طفه وه به سه ر یه کدا هاتوونه وه و ، جۆشیان خواردووه .. به و شێوه یه ی ڕه وانبێژیی داخوازیه تی ریزیان به ستووه و ته رتیب کراون ، هه ر ده ڵێی ملوانکه ی مرواری یه و ، به ڕێکوپێکی هۆندراوه ته وه ...!

بڕوانه چۆن یه که مجار ده ستنیشانی لایه نی هه ره گرنگی باسه که ده کاو ، له ڕزگار بوونی که شتی یه که وه ده ست پێ ده کا له کاتێکدا که له ناو گێژاو و شه پۆلی ئاودا هه ڵبه ز و قه ڵبه زیه تی ..

ئه م ڕزگاربوونه ش ئه نجام نادرێ مه گه ر به ڕۆچوونی ئه و ئاوه ی که له ده وری که شتی یه که یه!! له به رئه وه په روه ردگار له سه ره تاوه فه رمان به زه وی ده دا که ئه و ئاوه ی له سه ریه تی بیخواته وه و قووتی بدا (( یا أرض ابلعي ماءكِ)) .. به ڵام ئه گه ر باران به رده وام بێ و بروکه ی نه داتێ، له وانه یه ئه وانه که له که شتی یه که دادە به زن به ته واوی تووشی ته ڕ و تووشی و ناڕه حه تی ببن ، له به ر ئه وه خوای گه وره و به توانا فه رمانی کرد به ئاسمان که ئه ویش له باران بارین بوه ستێته وه و چی تر نه بارێنێ (( و یا سماء اقلعي )) ..

جا که زه وی ئاوی خۆی خوارده وه و هه ڵی چۆڕاندو، ئاسمانیش له باران بارین وه ستایه وه ، کاره سات ته واو بووه و ، هه موو شتێکێ براوه ته وه (( و قضي الأمر )) واته ئه وانه ی له عیلمی په روه ردگاردا بڕیار درا بوو که له ناو ده چن و ، ئه وانه ی ڕزگار بوونیان له زانستی خوادا بڕیار درابوو ، ئه نجام دراو کار ته واو بوو .. !

ئه مجار دێته سه ر باسی ڕاوه ستان و جێگیربوونی که شتی یه که له سه ر کێوی ( جودی ) .. پاشان دوعاو نزاکردن له

به هیلاکچووه کان ، پاش ئه وه ی که به سته مکار و که للـــــه ڕه ق تاوانباریان ده کا ، بۆ خاتـــــری ئاماژه ی ئه وه بکا که له ناوچوونه‌که ته نها بۆ ئه وانه بووه که شایانــــی سزان و موسته حه قی ئه و ڕۆژه ڕه شه بوون ..

جا چونکه فه رمانـــــــــــه ئیلاهی یه که ده ربــــــــــاره ی له ناوچوونی سته مکاران به شێوه‌یه‌کێ ده رچووه که س نه یبیستـــــووه و ، گوێ یان لێ نه بووه .. بۆیــــــــــه کردار ( فعل ) ه کان هه موویـــــــان به شێوه ی ( مبني للمجهـــــــول ) هاتوون .. له سه ره تاوه‌فه‌رموویه‌تـی (( و قيل يا أرضُ )) ، ئه مجار دوابـه - دوای ئه وه سه یری ئاواز و مۆسیقای دوو وشه ی ( ابلعي ) ، ( اقلعي ) بـــکه بڕوانه چه نـــد گونجاو و له بــــــارن له گه ڵ وشه ی پێش خۆیانــــــــدا ، ئه م دوو وشه یه هه ردوکیان خوازراوی زمانین و ، له مانای خۆیانـــــــــــه وه گوێزراونه ته وه بۆ مانــــــای تـــــــر ( إستعار ) ه یان تێدا به کارهاتووه !

ئه مجار که سه رنجی ڕستـــــــه ی (( ابلعي ماءكِ )) ده ده ین ، ده بینین وشه ی ( ابـــلعـي ) شێوه ی ئـــه و کاره مان پیشان ده دات که لــــه زه وی داواکراوه ئه نجامـی بـدا ، ئه ویـــش ئه وه یه که بـــه گورجی و هــــه رچـــی زووه چی ئاو هه یه قووتی بـــدات و هه ڵی مژێ .. دیاره ئه م مانایــــــه ی که ( ابلعي ) ده گه یه نێ ( امتصـــــي ) پێی پێ نابا (( ئه وه ی ئه حمـــه د ده یزانێ موحه ممه د ڕێی پێ نابا )) ! ئه وجار له وه دا که ئیزافه و نیسبه‌تـی ئاوه که ی داوه بۆ زه وی ئاماژه یه بۆ ئه وه که زه وی پێویسته ئاوی خـــۆی هه ڵمژێ ، چونکه ئاو ئاوی خۆیه تی !

له وشه ی ( إستوت ) که کـــرداری که شتی یه که یه ئه وه مان بـــــــــۆ ڕوون ده بێته وه که ڕاوه ستانی که مـــی - - یه که به جۆرێکێ بووه جوولانـــه وه و له رینه وه ی نه ماوه .. له نگه‌رێکی وای گرتووه که ئارام ئامێزبێ ، تا دانیشتوانی ناوی به ئاسانی لێی بێنه ده رێ و ترسیان نه بێ .. له ڕسته ی ( و قيـــل بُـعـــداً للقوم الظالمين ) یشدا ئاماژه بـــــۆ ئه وه کراوه که له ناوچوونی سته مکاران به و مه به سته بووه که پشێویی ســـه ر ئه رز نه مێنێ و ، ئه و ناپاکانه لـــــه خراپه کاریی سه رزه ویی دووربخرێنه وه ! .

# دار

اسامه جمیل / هەولێر



داریکی تەمەن درێژو
تەمام ئاسام ..
پەل بۆ هەموو دنیا داوێم ..
گەر خەڵکیی بەردم تێ بگرن
بەری شیرینیان بۆ داوێم ..
ئەگەر ویستیان بمبرنەوە
دەبمە داری سەر خانوویان ..
لێ ناگەڕێم
تەمی ڕەشی
سەرماو سۆڵی
زستانی قین
لەسەر لیویان شایی سازکا
بۆ مەرگی کۆرپەی پێکەنین .

*　*　*

دەبمە گۆچانی پەککەوتەو
کوێرو پیران ..
پەککەوتە بە چۆکدا بکەون و
دەمیان بچەقێتە زەوی ..

*　*　*

دەبمە داری نێو ئاگردان ..
تا منالآن بەهێمنی
گەرای قوولیان لێ بکەوێ ..
بەیانیش
پێش ئەوەی لەژێر پێخەفا
سەر دەربێنن
دەبمە گڕی ژێر خۆراکیان ..
تا دلێ ( ئەلگا ) نەقکەن و
جووی برەی
لێ دەربێنن .. ! *

---

* ئەم شیعرە لەو وتەیەی
پێغەمبەر وا ( بەننا ) وەرگیراوەکە
دەفەرموێ :
(( کونوا مع الناس کالشجر ..
یرمونه بالحجر .. فیرمیهم
بالثمر )) .

# ناسنامه

ماموّســتا
ئاوات غفور صالــح

وا کازیوه ی ولاّته که م
ڕوو له ڕوونی و بیـّـگه ردی یــه ..
ئاسـوّش منداڵێکی ساوای
پیّ به خیّر و سه روه ری یــه ..
بوّ شیری خوّر کروو(1) ئه گری
نه باوه شیهه وری ده ویّ ..
نه له ئه ستوّی گه رده لوول و
گره و ته م دا ئـوّقره ده گـرێ ..
په ڕ ناسکی و قــه د ئه ستووریی
نیّرگسی ئه م شویّنه سه ختــه
به گه رمای تیوونی عه رعه ر و
سه هوّلّ به نـدانی سیبـریـا
گه لــیّ په ستــه ..!
ئه م نیّرگــزه
فیّری سروه ی به هاری یــه ..
شه یدای جیلوه و عیشوه ی چه م و



پرچی قه زوان و ، جریوه ی
پاساریی گوێسوانه ی شڕی
کووخیلکه[2]ی کورده واری یه ..
ئه م نزاره
حوجره ی زانا و
ئه شکه وتی خه ڵوه و هه واری
( صلاح الدین ) و ( پیران ) و
( شێخ مارف ) و ( شه ڕه فخان ) و
چه نده های وه کو ( نووری ) یه ..
گه ر گوێ بگری له خوڕه ی ئاو
له هاژه و قه ڵبه زه ی لافاو
له سرته سرتی گه ڵا دار
له قاسپه ی که و ، له نه غمه ی تار
تێ ده گه ی ئه م کوردستانیه
ده نگ دانه وه ی
بانگی ( الله اکبر ) ی
ڕاچه نیو و ..
سروه هێن و ..
مژده ده ری
به یانی یه .

---

(1) گروو : بیانوو
(2) کوخیلکه : کوخه بچکۆله

oooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooo
++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++++



ئه نداز یــار
ئیبراهیــم صالــح

بــه بێ ئاگایــی لێی ده تــووم ، کۆتر قوڵپه ی گریانـیه تـــــــی
هه موو گیانـم تاوانـــــه و ، نازانـم چی تاوانـیه تــــــــی ؟
ئاخۆ وه کۆ ژیرێ نیێ بـگا ، یــا هه ر پیشه ی شه وانـیه تــی ؟
یــا بارانــی فرمێسکه کان ، تینــی ڕوونــی چاوانـیه تــــــی ؟
ئازیــز مرده یــه وا ده کا ، یـــا شیــوه نــی لاوانـیه تــی ؟
سروودی ئازادی وایــه ، یــا گـه ردانــی هیــجرانــیه تــی ؟
ئازار و سزای تــێر بــوونــه ، یــا داوای ئاوو نـانیه تی ؟
ئه سرین ڕێـژیــی سه رکه وتــنه ، یا به زینی مه یدانیه تــی ؟
زوبانــی حاڵــی وا ده ڵــێ ، ویــردی یــادی یه زدانــیه تـــی ؟
ده ســوێـــنـد به خــوا ! گه ر دانا بم ، گریانم پێش گریانیه تی*.

---

* هه وێڵـی ئه م شیعره له پارچه شیعرێکی
شاعیری خوانا س ( ابی السّهل الصعلوکـــی )
وه رگیــراوه .

# ئاشتی

خه ریکێ بوو تیشکی خـــــۆر
ماڵئاوایی ده کرد و ، باڵنده کانیـــش
ورده ورده به ره و لانه کانیــــــان
ده چوون .. ( ئاشتی ) ش سه ر سینی یەکێ
نێرگزی به ده سته وه بوو.. بــــــه
شه قامه کانی شاردا هه ر (هەی نێرگز) ی
ده کرد .. ده کرد .. قــــــژه زه رده
دانه هێنراوه که ی به م لاولای شانیــدا
شۆڕ بووبوویه وه ، لێوه وشکێ بووه‌کانی
به ڵکه بوون له سه ر ئه وه ی کـــــه
به ڕۆژووه ، هه رچه ند ڕۆژووی له سه ر
نه بوو به ڵام زۆری پێ خوش بوو، بۆیه
دایکی له به ر دڵی ئه و بۆ کاتـــــی
پارشێو به خه به ری ده هێنا .. ئــــه و
کیژی تاقانه ی دایکێ و باوکی بـــوو ،
له شه شی منداڵ له کیمیاوی بارانه که دا
ته نها ئه میان بۆ ده رچووبــــوو ..
ئه و بووبوو به خونچه ی تـــــازه
پشکووتوویان .. ته مه نی لـــه ده وری
حه وت و هه شت ساڵه دا بوو .. بۆیه
نێرگزی ئومێدی هه ردوکیان بــــوو ،
چونکه ئه مانیش پیر بووبــــوون و ،
توانای کاسپی یان نه مابوو ، بۆیـــه
ئه میان ده نارد بۆ نێرگز فرۆشتــــن
تا له پاره که ی خورما بــــــه شی
به ربانگیان به رێــته وه ..

جعفر محمد ئه ڵماس
هه ڵه بجه ی شه هید

خه ڵکیش خۆیان گۆڕی بوو.. به رگی جوان و ڕازاوه یان پۆشیبوو.. لاسایی به هاریان ده کرده وه و، ته قه ی خۆشی یان ده کرد، چونکه یه که م ڕۆژی به هاره و .. کێوه کان کفنه کانیان ده ڕزێن و ، تۆوه کانیش له ژێر زه وی دا ڕاست ده بنه وه.. چه ند مانایه کی جوانی هه یه ده ڵێی وێنه کێشیی قیامه ت ده که ن و ، تارایه کی سه وزی جوان داده ده نه وه به سه ر بووکی ئه مساڵدا ، به و هیوایه ی بووکی به هاری ئه مساڵ شه هید نه بێ و نه بێته قۆچی قوربانیی ده ستی ئه و چه په ڵا نه ی که چه نده ها ی تریان پێ شێل کرد ..

ئه مه ش له دڵی پڕ له سۆزی ئاشتیدا هه بوو ، هه ر چه نده دڵه بچکۆله که ی ئه م پڕبوو له فرمێسکی خوێنین ، که ده یبینی منداڵان ده ستی براو خوشکه کانیان گرتووه و ، له کۆڵان و شه قامه کاندا یاری ده که ن .. خوشکێ و براکانی ئه میش بوونه ته تۆوێکێ له گه ڵ خاکدا گوڵاڵه سووره ی به هاری پێ سه وز بووه ، توانا ی یاری کردنیان نیه و قسه ناکه ن .. ئه وه له لایه کێ، له لایه کی تره وه بیری له باری ژیانی خۆیانی ده کرده وه که پاره وه نانێ نی یه بیخۆن ، به لام هه ر دڵشاد بوو به وه ی که پتوانێ بیانزیێنێت و کاریان بۆ بکات ..

خه ڵکی ئاگایان له م دڵه خه فه تباره سووتاوه نه بوو .. نیوه ی نێرگزه که ی فرۆشتبوو، پاره که ی هه ر له مشتا بوو و ، ده یژمارد و سه یری ده کردن .. چونکه په له ی بوو تا کیلۆیه کێ خورمای پێ بکڕێ و، بیباته وه بۆ ماڵه وه .. چونکه ئێستا هه ر چاوه ڕێی ده که ن که بکات به ماڵدا و ، به ده می پڕ له پێکه نین و ده ستی پڕ له خورما هێدی هێدی به سه ر شۆسته کاندا هه ی نێرگزی ده کرد ، به لام له ناکاودا چزه له سه ر سنگی هه ستا و ، خوێنه ئاڵ و گه شه که ی به ملا ولای سنگیدا جۆگه له ی به ست و ، نێرگزه کان به سه ر ده ستیه وه په ڕین و پرژ و بلاو بوون .. به لام پاره که ی توند گرتبوو و مشتی نه دکرده وه .. خوێن له سه ر سنگی قولپی ده دا .. زۆریکێ له نێرگزه کانی سوور کرد ..

گولّه یه خه ی به هاری ئه م گولله یه کی وێل بوو ، که سه ر سنگی سوور کرد بوو .. وه کۆ گولاّ له سووره یه کۆ ڕوا بێ وابوو .. به لاشه ی شه که ت و ماندووه وه و، به زمانی به ڕۆژووه وه دواهه ناسه ی ژیانی له سه ر ئه و شه قامه هه ڵکێشا .. مه لی ژینی دای له شه قه ی باڵی به ره و باره گای خوا ، له وێشه وه به ره و لای خوشکۆ و براکانی ، تا له به هه شتدا تێر یاری بکه ن ..

ئای ( ئاشتی ) نێرگزه کان وه کۆ هیوا و ئومێده کانت بێ ناز که وتوون ، ماتن ، به دیار ته رمه که ته وه دۆش داماون ..

ئای ئه م ئێواره یه بابه و دایه ی دلّ زامدارت ده بێ سوێی زامه که یان بێته وه و ، به داخ و خه فه ته وه به ربانگ بکه نه وه، ئه ویش ئه گه ر شتێکیان ده ست بکه وێت بیخۆن .

چیرۆکێکی وه رگێڕدراوه

# وانه و په پووله

**مامۆستا**

**محمد امین احمد**

له ژووره که ی خۆم دانیشتبووم، وانه کانم ده خوێنده وه .. له ناکاو سه رم هه ڵبڕی ، دیتم په پووله یه کی سپیی جوان جوان له ژووره که مدا دێت و ده چێت !!

گوتم :

ـ دایه ! دایه ! سه یرکه ، ئه و په پووله سپی یه چه ند جوانه !

دایکم بێ ئه وه ی سه ر هه ڵبڕێ به ده م یاپراخ پێچانه وه وه گوتی :

+ خه نده گیان ! په پووله مژده ی به هاری پێیه !

دووباره که وتمه خوێندنه‌وه‌ی وانه‌کانم .. له ڕاستیدا هه‌رچه‌نده‌ ده‌مخوێنده‌وه‌، به‌ڵام هیچ تێنه‌ده‌گه‌یشتم. به‌ناو مێرگ و کێڵگه‌ و باغ و ڕه‌زو چڕه‌ دره‌خته‌کانا، به‌ناو گوڵ و گوڵزاره‌کانا، به‌ دووی ئه‌و په‌پووله‌ زه‌رد و سوور و سپی و شینانه‌دا ڕام ده‌کرد ..

له‌ ژێر ئاسمانی شینی کوردستانا، بینیم کیژۆڵه‌یه‌کی چاوشین، قژ زه‌رد، کوڵم ئاڵ، سه‌رتاپا بالای به‌تارایه‌کی ئه‌رخه‌وانی داپۆشرابوو، بانگی کردم، گوتی:

ـ من به‌هارم .. من نه‌ورۆزم ..

گوتم:

+ چۆن تۆ به‌هاری و نه‌ورۆزی ؟

گوتی:

ـ من ئه‌و کیژه‌م له‌ناو چره‌دوکه‌ڵی هه‌ڵبجه‌ی شه‌هیددا ده‌رباز بووم .. له‌ناو ئه‌نفاله‌کانی گه‌رمیانی گڕگرتوودا له‌ دایک بووم.. له‌ فرمێسک قه‌تیس ماوه‌کانی دایکی شه‌هیدانم ..

گوتم:

+ ئه‌مه‌ تۆی له‌ کتێبه‌ نهێنییه‌کانی باوکم‌دا باست ده‌که‌ن !!

گوتی:

ـ به‌ڵێ، به‌ڵێ، من به‌هارم .. من نه‌ورۆزم .. خوێنی ئاڵی گه‌شی سنووری کوردستانه‌ .. چاوه‌ شینه‌کانم کانیاوه‌ ڕوونه‌کانه‌ .. سه‌رپۆشه‌که‌م تارای سه‌وزی شه‌هیدانه‌ .. کوڵمه‌کانم به‌رهه‌می خوێنی پڕژاوی ساواکانه‌ .. ئه‌سپه‌که‌م ته‌ته‌ری مژدانه‌ی به‌هاری ڕاپه‌ڕینی کوردانه‌ ..

ده‌فته‌ره‌که‌م له‌ پێش ده‌میا دانا، گوتم:

+ ناوی خۆتم له‌سه‌ر په‌ڕه‌ سپی‌یه‌که‌م بۆ بنووسه‌ .. ئه‌م ڕۆژه‌ نوێیه‌م بۆ تۆمار بکه‌ ..

ویستی داخوازی‌یه‌که‌م بۆ به‌جێ بێنێت، به‌ڵام له‌باتی ناوی خۆیم بۆ بنووسێت، نه‌خشه‌ی کوردستانی پڕ له‌ دره‌خت و، گوڵ و، چۆله‌که‌ و، ڕۆژه‌گه‌شه‌کانی بۆ وێنه‌ کێشام .



# پەیامی زانستی



لەم

بەشەدا :

* خانەکانی شانەی هەنگ؛ بۆ شەشلان ؟!
* فیزیای نوێ
چی دەڵێ ؟



# خانەکانی شانەی هەنگ بۆ شەش لان ؟

محمد احمد محمود

ئەگەر بەوردی سەرنجێکی شانەی هەنگ بدەین، ئەوا لەوانەیە پرسیارێک بێت بە خەیاڵماندا و، بڵێین: ئایا هەنگ بۆچی خانەکانی شانەکەی لە شێوەی شەش لاییدا دروست دەکات؟ ئایا بۆچی لە شێوەکانی سێگۆشە یا چوارگۆشە یان لاکێشە یان پێنج لا یان بازنە یان.. هتد دروست ناکات و، تەنها شێوەی شەش لایی هەڵبژاردووە ؟!

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین:

(١) ئەگەر هەنگ خانەکانی شانەکەی لە شێوەی پێنج لایی یان بازنەییدا دروست بکردایە،



ئەوا چەند بۆشاییەکی دیاریکراو لە نێوان خانەکانیدا دەمایەوە، ئەم ڕووبەرانەش بە بێکەڵک و ونبوو دەژمێردران.

هەروەها پێویستی بەوە دەکرد کە زیاتر لە ماددەی مۆم بەکار بهێنێت بۆ دروستکردنی دیوارەکانی ئەم خانانە و، نێوانی ئەم خانانە ببنە شوێنی پیسایی و کۆبوونەوەی خاک.

(٢) گریمان هه نگ ئه م خانانه ی له شێوه ی لاکێشه یی یان چوارگۆشه یی یان سێگۆشه ییدا دروست بکردیایه ، ڕاسته هیچ ڕووبه رێکی زیاده نه ده مایه وه که سوودی لێ وه رنه گیرێ ، به لام ئه م شێوانه چه ند نه نگی و که موکووڕی یه کیان ده بوو ، که ئه مانه ن :



١ ـ کاتیگه وره بوونی لارقه کان (الیرقات) :

کاتێ گه راکانی هه نگ گه وره ده بن له م خانانه دا شێوه یان نزیکه له لووله یی یه وه ، وه خانه شه شلایی یه کانیش نزیکن له شێوه ی لووله یی یه وه زیاتر له شێوه کانی تر (چوارگۆشه یی و لاکێشه یی و سێگوشه یی) .

٢ ـ بۆ دروست کردنی ئه م خانانه پێویستمان به ڕێژه یه کی زیاتر هه یه له مادده ی مۆم (الشمع) بۆ دروستکردنی دیواره کانی ، ئه گه ر به راورد کرا له گه ڵ شێوه ی شه شلایی دا .

(٣) بۆ ئه وه ی بزانین کام شێوه به که ڵکه له بواری ئابووری دا بۆ کۆکردنه وه ی هه نگوین ، ئه وا ئێمه ڕووبه ری ئه و ڕووه ده پشکنین که ده توانرێ پێک بهێنرێت به هۆی به کارهێنانی یه که یه کی درێژی یه وه ( سم ) یا ( م ) .

بۆ نموونه :

* ئه گه ر یه که ی سه نتیمه تر وه ر بگرین بۆ پێکهینانی شێوه یه کی سێگوشه یی ئه وا ڕووبه رێکمان ده ست ده که وێت که بریتی یه له ( ٥ر٠ سم٢ ) .

* ئه گه ر ئه م یه ک سه نتیمه تره به کار هێنرا بۆ پێکهینانی شێوه ی چوارلایه ک (چوارگۆشه ـ لاکێشه ) ، ئه وا ڕووبه رێکمان ده ست ده که وێت که بریتی یه له ( ٦ر٠ سم٢ ) .

* دیسان ئه گه ر ئه م یه ک سه نتیمه تره به کارهێنرا بۆ پێکهینانی شێوه ی شه شلایه ک ، ئه وا ڕووبه رێکمان ده ست ده که وێت

که بریتی یه له ( ۷ر ۰ سم ۲ ) ..
که وانه ئه م شێوه یه لـــــه د وو شێوه که ی پێشوو باشتره لـــــه م بواره دا ..

* شتێکی ڕاسته که شێوه ی بازنه‌یی بۆ یه کێ سه نتیمه تر ڕووبـــــه ری ( ۹ ر ۰ سم۲) مان پێ‌ده به خشـــێ به لاّم وه کێ وتمان :

ـ ئه گه ر خانه کان بازنه یی بوونایه ئه وا بۆشایی نێوان بازنــه کـــان ده بووه شوێنی کۆبوونـــــه وه‌ی پیسایـــی .

ـ چێوه ی بازنه یه کێ به شداریـــی پێکهێنانی چێوه ی بازنه یه کی تــر ناکات .. به ڵکو هه ر بازنه یـــه کێ چێوه یه کی دیاریکراو و بێ لایه نـــی خۆی هه یه ، که چی له هه مان کاتـــدا هه ر لایه کێ له لاکانـــی شه شـلا به شداری ده کات له پێکهێنانـــی خانه هاوسێکه یـدا ، که ئـــه مه ش ده بێته هۆی که م سه رف کردنـــی مادده ی مۆم له دروستکـــردنـــی شانه که دا ..

ده ی که وا بێ‌چۆن ئه م هه نگه ڕێنموونی کرا بۆ چاکتریـــــن و ته واوتـــریـــن شێـــــــوه له دروست کردنی خانه کانـــــی شانه که یدا ؟؟!

کام زانای بیرکاری زان فێری ئه مـه ی کرد ؟!

ئێمه ش له گه ڵ زانای بیرکـاری زان ( پاپۆس )* دا ده ڵێین :

" ئه مه ئیلهامێکی خوایی‌نه بـــێ هیچ شتێکی تر نی یه .. " .

//////////////////////////////

سه رچاوه و پـه راوێز :

---

* **پاپۆس** PAPPUS یه کێکه لـه زانا به ناوبانگه کانی بیرکاری .. لـــه هه موو زاناکانی تر زیاتر گرنگیی داوه به توێژینه وه ی خانه کانی شانــــه ی هه نگێ له بواری بیرکـــــاری و ئه ندازه یی دا ، ئه ویش ئه وه بوو کـه هه ستا به توێژینه وه ی هه موو شێوه ئه ندازه یی یه کان ( سێگۆشـــــه ، چوارگۆشه ، لاکێشه ، بازنـــــه ، پێنج لا ، شه ش لا ، حه وت لا ، .. هتد )

---

سوود له م سه رچاوه یه وه رگیراوه :
( **النحل والعسل** ) / اورخان محمـــد علي ـ مجلة التربية الاسلاميـــة / السنة ۳۱ ـ العـدد ۷ /كانون ۱۹۹۰/۱

ooooooooooo

# فیزیای نوێ چی دەڵێ ؟



زۆر لە خوێندەواران زانـــای فیزیایی بە ناوبانگ ( پاوڵ دیفیـز ) دەناسن ، خاوەنی کتێبی (( خـــوا و فیزیای نوێ - God and New Physics )) کە لە ماوەیەکی کەمدا چوار چاپی لێ دەرچوو..

جا دە بێ ڕای خوێندەوارانی ئازیز چی بێ، گەر بێتو گەشتێکی خێرا بە ناو جیهانی گۆڕاوی ئەم زانا بە ناوبانگەدا بکەین ؟ کە هەموو کتێبەکانی بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر و بێ هاوتا لە لایەن زۆر لە ناوەند و مەڵبەندە زانستی و کۆمەڵایەتییەکاندا پێشوازیی کراون .

( پاوڵ دیفیز ) لە کتێبەکەیدا

باوکی دانا

باسی پرسیارە سەرەکی و بناغەییەکانی سەر بە " دروستکراوان " دەکات و ، دەڵێت:

" وای بۆ دەچم کە فیزیای نوێ هەندێ بۆچوونی تازە دەربارەی مرۆڤ و بوونی مرۆڤی گرتۆتە خۆی . لە ڕاستیدا ئەو پرسیارە سەرەکی- -یانەی کە دەربارەی بوونەوەرن وەک ( چۆن گەردوون دەستی پێ کرد ؟ و چۆن کۆتایی دێت ؟ ماددە چی یە ؟

ژیان چی یه ؟ هۆش چی یه ؟ ...
پرسیاری کۆنن ، به لام ئه وه ی که نوێ یه له مه سه له که دا ئه وه یه که ئێمه خه ریکه ده ستمان ده گاته ئه و ڕاده یه ی که بتوانین وه لامی ته واوی هه موو ئه م پرسیارانه بده ینه وه .. ئێمه له سایه ی ئه و په ره سه ندن و پێشکه وتنانه ی که به م دوایی یه دا به سه ر زانستی فیزیادا هات ، به م قۆناغه گه یشتین " .

پاول دیفیز له دووتوێی کتێبه که یدا زۆر پرسیاری قوول دووباره ده کاته وه ، وه ک: هۆی دروست کردنی گه ردوون چی یه ؟ بۆچی گه ردوون به م وێنه یه ی ئێستایه تی ؟! ... وای بۆ ده چێ که زانست ئێستاکێ له وه لامی پرسیارانه ده گه ڕێت ، که پێشتر ته نها پێشه و کاری ئایینه کان بوو .. هه روه ها باوه ڕ به وه ش ناکات که گه ردوون ده ره نجامی ڕێکه وتی کوێرو بێ ده سه لات بێ ، باوه ڕیش ناکات که گه ردوون بێ مه به ست یاخود بێ ئامانج بێت .. له کتێبه که یدا ده لێت : " هه موو ئه و یاسایانه ی که گه ردوونیان هێناوه ته بوون ته نها ده ره نجامی نیزام و پیڕه وێکی ئێجگار ورده " .

دوای چه ند دێرێک ده لێ :

" هه ر ڕووداوێک ده بێت هۆیه کی هه بێت ، گه ر ڕامێنین له زنجیره ی هۆکان ناتوانین بیر له زنجیره یه کی بێ کۆتایی ئه م هۆیانه بکه ینه وه ، که وابوو ده بێ هۆی یه که مین بۆ هه ر شتێک هه بێت ، خوا ش هۆی یه که مینه ، له به رئه وه هه ر ڕوونکردنه وه یه ک یاخود ڕاقه کردنێک بۆ گه ردوون ده بێ پال بداته وه به هۆیه ک که له سه رووی سروشت و جیهانی فیزیایی یه وه بێت ، واته پال بداته وه به ر خوا .. گه ردوونیش بۆیه به م شێوه یه ی ئێستایه تی چونکه ویستی خوا وا بووه " .

دریژه به قسه که ی ده دات و، ده لێ:
" زانست -به پێی پێناسه ی خۆی- ته نها جیهانی مادده لێک ده داته وه ، ده شتوانی به پشتیوانی شتێکی تر .. هه ر شتێ له گه ردوون لێک بداته وه . به لام گه ردوون به تێکڕایی ناتوانرێ ڕاقه بکرێت ، ته نها به وه نه بێت

که له عه ده مه وه (له هیچـــه وه) ده ست پێ بکرێت .. واته دروستکردن و داهێنان له هیچه وه ، واته له لایـــه ن (کردگار) ه وه که هه موو بوونه وه ری له نه بوونه وه داهێناوه " .

له دواییدا ده ڵێت : "گرنگترین



دۆزینه وه له چه رخی ئه مرۆماندا ئه وه یه که ئه م گه ردوونـــه ی تێیدا ده ژین و گوزه رانی تێـــدا ده که ین له ئه زه له وه نه بووه .. (واته سه ره تایه کی هه یه) .

له پاشانـدا هه ر به خـۆی وه لامی پرسیاره که ی پێشـــووی ده داته وه : " بۆیه زانست ئه مرۆ ڕووبه ڕووی پرسیاری گه وره و قووڵــی وه ک : چۆن گه ردوون هاته بوون ؟ بۆچی به م وێنه و شێوه یـــه ی ئێستای دروست کراوه؟.. ده بێته وه ، چه نده ها چه رخ به سه ر مرۆڤـدا تێپه ڕی و هه ر وای ده زانـی که ناتوانرێ و نابێ له هیچه وه هیـچ شتی بێته بوون .. به لام ئێمه ئه مرۆ چاک ده زانین که هه موو شتێ لـه هیچه وه هاته بوون و په یدا بـوو . چونکه (ته قینه وه ی گـــه وره Big Bang) ده رئه نجامی کارێکی خوایی یه ، بێ ئه وه ی که ئـه م ته قینه وه یه به زنجیره ی (هـۆو - ده ره نجام) ه وه ببه سترێته وه " .

(ڕۆبرت گاسترۆ) به رامبه ر بـه م ڕووداوه ده گاته قه ناعه تێک و ده ڵێ: (ته قینه وه ی گه وره ، به م پێناسـه کردنه ، مانای پێچه وانه بـی و دژ بوونی ده رئه نجام ده گه یه نێ له گه ڵ هه موو یاساو ده ستووره زانستی یه کان و ، نه گونجانی یه تی له گه ڵیاندا ، له دایک بوونی گه ردوون گه وره ترین و زه قترین ده رئه نجامی پێچه وانـــه و ڕوخێنه ری یاساو ده ستووره زانستی یه کانه) .

به لام پاول دیفیز ، زیاتر باسی

ئه م مه سه له يه ده كات و ده لّيّت : ( ئه و بيرو باوه ره ى كه ده يووت " ناتوانريّت له هيچه وه شت دروست بكريّت " هه ره سی هيّنا و رووخا .. به لّيّ .. به رووداوی " ته قينه وه ی گه وره " بيری ئه زه لی يه تی مادده رما و بيری " دروست كردن - الخَلق -" جيّ ی " بوونی " گرته وه و گه رانه وه به ره و باوه رهيّنان به خوا روويدا ئه و باوه ره ی كه پيّشتر پشت گویّ خرابوو و دووره په ريّزه بوون لیّ ی به تايبه تی له چه رخی نۆزده هه ميندا ، تيۆری ( ته قينه وه ی گه وره ) كه ليّنيّكی گه وره ی له دلّی ماتيرياليزمی يه ت - ماددی يمت - داكردوه ، دوا جار ( كوانته م ميكانيزم ) هاتوو ئه م كه ليّنه ی گه وره ترو فراوانتر كرده وه .

" گه ردوون هه ر له سه ره تاوه دروستكرا ، به لاّم كرداری دروست كردن رانه وه ستا ، له هه موو ساتيّكدا كرداری دروستكردنی به رده وام هه يه " .

پاولّ ديفيز ، ئه م قه ناعه ته ی خۆی جاريّكی تر دووپات ده كاته وه :

( بیّ گومانين له وه ی كه گه ردوون هه يه .. ئه مه راستی يه كه كه س مشت و مری له سه ر ناكات ، ده بیّ راڤه يه كێ بۆ ئه م گه ردوونه هه بيّت ئه ويش خوايه .. ئه و خوايه ی كه به توانای خۆی هه موو شتيّكی گرتۆته ده ست و وای لیّ ده كات كه هه بیّ ) .

له پاشاندا ده لّیّ :

( گه ر بتوانين ريّگه ی خۆمان به ره و خوا بدۆزينه وه ، ئه مه ش ته نها له ريّگه ی ئه و شتانه ی كه له گه ردووندا ده يدۆزينه وه ده بيّت ، نه وه كێ له ريّگه ی ئه و شتانه ی كه نه مان توانيوه بيان دۆزينه وه ، ئه وه ی كه تا ئيّستا زانيومانه و دۆزيومانه ته وه له گه ردووندا ، په نجه بۆ بوونی خوا و توانا و زانستی راده كيّشين ) .

هه روه ها ده لّيّت :

( ناسينی تاكه خوايه كێ زۆر ئاسانتره له ناسينی چه نده ها خواوه ندی بیّ ژماره ) .

به شيّوازه جوان و يه كگرتووه كه ی و رسته مه نطقی يه پته وه كانی وه به زمانی خويّنده وار ان له خۆی ده پرسیّ ( ئايا ده توانين بۆ ئه وه بچين كه



ئه و توانایه ی که گه ردوونی دروست کرد ، مادده‌ی به ته نها دروست کرد به بێ دروستکردنی وه‌خت؟)

لێره دا ڕسته یه کی ( قه دیس ئانسلیم ) ده هێنێته وه که ده ڵێت : (( خوا له ده ره وه ی وه خته و له سه رووی وه خته وه یه )) ، دوای ئه وه ڕای خۆی ده خاته پاڵ ئه و ڕسته یه و ده ڵێت : ( گه ر له بۆچوونماندا خوا بخه ینه چوارچێوه‌ی وه خته وه و به وه خته وه بیبه ستینه وه ، به وه ئێمه له پایه دارێتی و کردگارێتیی که م ده که ینه وه ، ده بێ ئه وه شمان له یاد نه چێ که خوا خۆی کردگاری مادده یه ، که مادده ش وه‌ک ده زانین به وه خته وه به نده ) .

له به شی پێش دوایه مین به شی کتێبه که یدا ( پاوڵ دیفیز) بابه تی ( کۆتایی هاتنی گه ردوون) واته : ( قیامه ت ) باس ده کات به شێوازی زانایه کی لێهاتوو وێنه ی ئه و کۆتایی یه دراماوی یه ده کێشێ ، هه روه ها وێنه و باسی قۆناغی په رده دادانه وه به سه ر ئه م گه ردوونه دا ده کات و، ده ڵێت: ( کۆتایی هاتنی گه ردوون له وانه یه له به شێکی بچووکی به شه کانی چرکه دا ڕوو بدات ) هه روه‌ک چۆن سه ره تا به کرداری (ته قینه وه ی گه وره ) ده ستی پێ کرد.. کۆتایی- -یه که شی هه روا ده ست پێ ده کات ( چۆن بۆشایی و وه خت و مادده

لـــــه چرکه یه کداو به شێوه یه کی خێراو له پڕ هاته بوون ، هه روه ها ش دوور نی یه که هه مان شتـــــــی پێچه وانه یی ڕووبدات و به هه مـان ڕێگه ش .. ئه مه ش وه نه بێ ته نهـا له بازنه ی بۆچوون دا بێت ، به ڵکو له وه زۆر قووڵتره ، چونکه زۆر لـــه زانایان هاوده نگن له سه ر بیـــری ڕوودانی قیامه ت و کۆتایی پێ هاتنی ته مه نی گه ردوون ) .

**هه موو شتێکێ به هه موو شتێکـــه وه بــه نــده :**

گه ردوون دروست کرا ، ئـــــه م گه ردوونه ش ( واتا هه مووشتێ ) لـــه هه موو ساتێکدا دروست ده کرێـت ، هه موو شتێکیش که دروست ده کرێـت به نده به هه مـوو شتێکه وه .

( پاولْ دیفیز ) له کتێبه که یـدا ئه م خاڵه ڕاڤه ده کات و، ده ڵێت : ( هه موو شتێکێ ، بچووکێ بێت یـــا گه وره ، ساکار بێت یا ئاڵــــــۆز، ته نێکی گه ردوونی بێت یا خود ئه تۆم.. هه موو شتێکێ به هه موو شتێکـــــه وه به نده و، پێداویستی به هه مـــــــوو شتێکێ هه یه .. ئه مه ش به شێکه لـــه ڕاستی یه کێ که لێی جیا نابێته وه .. ناشکرێ که شتێ هه بێ به نه بوونـــی شته کانی تر ، له نێو بناغه ی گه ردووندا به کبوونێکی قووڵ و به هێـــــــــــز شاردراوه ته وه .. ئه م یه کبوونـــــه یاخود ئه م یه کێتی یه ی پێمـــــــان ڕاده گه یه نێ که : گه ر هه مــــــــوو شته کان نه بوونایه ئه وا هیـــــــــچ شتێـکێ نـــه ده بـوو ) .

هــه مــوو شتــێ ..
گه ر دوور بێت یاخود نـزیـکێ
بــه یه که وه بــه نـدن ..
به نـد بوونێکی شارراوه ..
به ده ستی قودره تی هه تاهه تایی ،
گوڵێکێ چی یه دروست ناکرێ و ..
نایــه تــه بــوون ..
گه ر ئه و ده سته
نه توانێ ئه ستێره یه کێ
لـه شوێنـی خۆی بجووڵێنێ !!

**((فرانسیس تۆمسون ی شاعــیر))**






**پەیام دۆستانی بەوەفـــا :**

پڕ بە دڵ سوپاس و پێزانینی خۆمانتان پێشکەش دەکەین لەسەر ئـــــەو هاوکاری و بەشداری یەگەرم و گوڕەتان ، داواکارین لە خوای گەورە کە زیاتـــر بەرەکەت بخاتە نووسین و بەرهەمەکانتان . وا ئەم جارەش ئێوە و بەشێک لە وەڵامی نامە و بەرهەمە ڕەنگینەکانتان :

* بەڕێز کاک شێرزاد محمد ڕەحیم لە سلێمانی ! شیعرەکەت دروشـم ئامێزە کەمتر بەنـــاخـــــــی مەبەستەکاندا قووڵ بوویتەوە ، هیواداریــن مەبەستەکانت لە تابلۆی چڕو پڕی شیعریدا خست بکەیتەوە . زیاتر گرنگی بە هونەری شیعری نوێ بدەیت . هیوای سەرکەو تنـت بـــۆ دەخوازین و نامەمان لێ مەبڕە .

* بەڕێز کاک طالب حمە سعیـــد محمـود لە سلێمانـی ! سوپاســـی ئەو هاوکاری یەگەرم و گــــــوڕە بەردەوامەت دەکەیـن . شیعرەکانـت گەیشتن ، ئەمەش کۆپلەیەک لـــــە شیعری ( گوڵی خواناسان ) ت :

لە نێو گژو گیای زەد بەنی جـــڕدا
گوڵی خواناســان بە لێو پۆی لێدا
ــڵێی لە دڕک و داڵ نەکـــردەوە
لە باخی ژینا خۆی نمایـــــشدا

* بەڕێز کاک خولیـا ! چەنـــد چوارینەیەکی بۆ ناردووین سوپاســـی هاوکاریی بەردەوامی دەکەین .

ئه مه ش چوارینه یه کیانه :

مرۆڤ تا مه زرۆی دڵت بچێژه
به ماصی سوود به ر بۆ گوڵ بنێژه
هه وڵێ ، کرداری . گفتێ بنێژه
که وا سوود مه ند بێ لاری مه چێژه

* به ڕێز کاکۀ سه ردار حه مه لاو (باکی) ! سوپاسی وه فاداریت ده که ین بۆ گۆڤاره که . شیعره کانت سه ره ڕای درێژی ، زیاتر به ده وری ئامۆژگاریی ڕاسته خۆدا ده خولێنه وه ده توانرێت له شوێنی خۆیدا سوودیان لێ وه ربگیرێت . چاوه ڕوانی به رهه می ترین .

* به ڕێز کاکۀ کامل محمود شیعرێکی بۆ ناردووین ئه م کۆپله یه کیه تی :

به دیهێنه ر !
خاوه ن به زه یی داد په روه ر
که هه وره کان
به ری ئاسمان ئه گرنه وه
بۆ سه رنجێکی گه ورمییت ، ئه نالێنن
نه ب به ئاو . . ئه توێنه وه .

* به ڕێز کاکۀ ابراهیم احمد له به رزنجه ! زۆر سوپاسی ئه و هه سته به جۆشه ت ده که ین که به رامبه ر گۆڤاره که و کارمه ندانی ده رت بڕیوه . وه ئامۆژگاریمان بۆ تازه شاعیران ئه وه یه که زۆرتر بخوێننه وه و ئاگاداری کاروانی شیعری بن که گه یشتۆته کوێ و په له نه که ن له نووسیندا . ئه مه ش به شێکۀ له شیعره که ت (کۆچ) :

ئه ی ئا که مۆمی گیرساوی باوه ڕ
به نده ی پاکی خوا له نا و بوونه وه ر
تا که ئومێدی چه وساوه ی جیهان
بۆ ڕزگار بوونیان له به نده ی به ندان
پیرۆز بێت یادی کۆچی پیرۆزت
بیره وه ری یه که بۆ گشت دڵسۆزت

* به ڕێز خوشکه که وکه ب هه ورامانی ! هاوکاریت جێگای سوپاس و ڕێزمانه . . وێڕای ئه وه ی که شیعری (له دایکۀ بوونی پێغه مبه ر) له دیوانه که ت (خانمه که ی بیاره و ته وێڵه) دا بڵاوکراوه ته وه . له گه ڵ شیعره که ی تردا بۆ هه ندێ بۆنه و بواری تایبه تی زۆر گونجاو باشن ، هیواداریین نامه مان لێ نه بڕی و سه رکه وتووبی .

* به ڕێز کاکۀ عثمان محمد عبد الرحمن ! سوپاسی نامه ڕه نگینه که ت ده که ین . شیعره که ت که به بۆنه ی کاره ساتی هه ڵه بجه وه ناردبووت کاتی به سه رچووه .
چاوه ڕوانی به رهه می ترین .

* خاوەنی هۆنراوەی ( داری ئاوبدە ) کاک بورهان جەباری لە چەمچەماڵ ! سوپاسی هەستی برایانەت دەکەین . هۆنراوەکەت لە رووی ماناوە جوانە بەلام لە رووی دەربرین و دارشتنەوە هێشتا ماویەتی . سەرکەوتووبی .

* بەرێز کاک عبداللە احمد شیعرێکی بەناونیشانی ( تاسەی دیدار ) بۆ ناردووین . . وێرای بلاوبوونەوەی لە ( هەڵهاتنەوەیەکی نوێ ) دا لەگەڵ رێز و سوپاسماندا ئەم کۆپلەیەی دەکەینە دیاری خوێنەران :

کانگای باوەڕ ! !
دڵی نامۆ !
ناو دەسنێنێت . . .
کورەی گڕی ژیلەمۆ . .
باڵی نەخشینی دیدارێک
دەسوتێنێت
بەنامەزرۆ

* برای بەرێز کاک همایۆن صاحب لە هەڵەبجەی شەهید ! شیعرەکانت هەستی ناسک و سۆزی بەجۆشیان تێدایە و بەڵگەن لەسەر بوونی توانا و هەستی شاعیرانەت . هیوای دوا رۆژێکی پرشنگدارت لە خوای گەورە بۆ دەخوازین ، چاوەڕوانی بەرهەمی ترین . لەبەر درێژی ( بەفری سپی و شەوی مردن ) وا ئەم کۆپلەیەی دەکەینە دیاری :

تەم و مژ و گزەبایە
گرێوەیە
دوو منداڵی سەرما بردوو
لە قەراخی جادەکە وتوو
چاوەڕوانی کۆشی گەرمن
چاوەڕێی پێخەفی نەرمن
چاوەڕوانن
چاوەڕوانی سۆزی دایکی میهرەبانن
بەلام سەد ئاخ
هەر دەبارێ و گرێوەیە
بۆ لای ئەمان
مەرگ دێت و بەرێوەیە

* بەرێزان : کاک سەلمان ، ابوبکر علی ، عزت میکە علی ، کاک ئاسۆ ، برایان شیعرەکانتان گەیشتن . چاوەڕوانی بەرهەمی تازە و بەپێزتانین . هیواداریـن خامەتان بەبرشتانەتر دابەزێتە مەیدانی ئەدەبی .

* بەرێز خوشکە شلێر محمد حسین ئەندامی کۆمەڵەی زانست خوازانی

کوردستان . بابه ته که ت ( چه نـــــد ئاماژه یه کی زانستی له قورئانــــــی پیرۆز ) دا گه یشت ، سوپاســــــی هاوکاریت ده که یـن . . له به ر ئه وه ی هه ندێکی زۆر له و باسانه بــــــلاو کراونه ته وه به هه مان ناونیشـــــان له لایه ن برای به ڕێز کاکێ هێمـــــن گه رمیانی له ژماره پێشووه کانـــــی په یامدا . له به رئه وه نه مانتوانـی دووباره بلاویان بکه ینه وه .

چاوه ڕوانی به رهـه می تر تانیـن .

(*) به ڕێز کاکێ هیوا مغدید ابراهیم له هه ولێـر ! زۆر سوپاسـی خـــه م خواردنت ده که ین بۆ به ره و پێــــش بردنی گۆڤاره که . تێبینیه کانـــــت گه یشتن إن شاء اللّه له داهاتـــوود ا سوودیان لێ وه ر ده گیرێـت .

(*) به ڕێز کاکێ لطیف فتاح رضـــا ! بابه ته که ت ( پێناسه ی دڵه کان لـــه ڕوانگه ی قورئانه وه ) ده ستت خۆش بێ و سه رکه وتووبی . کاکی برا ! ئه و ئایه تانه ی که به نموونه باســــــت کردبـوون له ڕاستیدا هیچ کامیـــــان په یوه ندی یان به باسه که وه نیـه . . گه ر بته وێ له پێناسه ی قورئان بــۆ دڵه کان ئاگادار بیته وه سه یری ئه م ئایه تانه بکه ( ۲ ، ۷ ، ۱۰ ، ۷٤ ، ۸۸ ، ۲۸۳ سوره تی بقـرة / ۷ ، ۸ ، ۱۵۹ آل عمران ۱۰۱ ، ۱۷۹ اعراف / ۲۸ رعـد )

(*) به ڕێزان کاکێ دلشاد احمـــــد و کاکێ هیوا امین محمد ! باسه کانتان ( سکێ چوونی منداڵ ) و ( مه لاریـــا ) گه یشتن و زۆر سوپاسی هاوکاریتـا ن ده که ین ، باسه کانتـان جوانن بـــه لام له به رئه وه ی له ژماره ی پێشــــوودا هه مان بابه تمان بلاوکـــــــرده وه نه مانتوانی دووباره بلاویان بکه ینـــه وه چاوه ڕوانی به رهه می ترتانیـــن .

(*) خاوه نی باسی ( پێشبرکێ و ده ست پێشخه ری به دوو واتا ) کاکی بـــــرا ! نازانین له به رچی ناوت نه نووسیبوو! هیواداریـن که دووباره نه یێته وه . هه رسه رکه وتوبیـــــت .

(*) به ڕێز کاکێ محمد دوکانی لــــــه پیره مه گروون ! نامــــــــه و پێشنیاره کانت گه یشتن ، زۆر سوپاسی هاوکاریت ده که ین .. هه ندێ لــــــه پێشنیاره کانت له بارو دۆخـــــــی ئێستاماندا ناتوانرێت جــــــێ به جێ بکرێن . هه ر سه رکه وتووبیت ..

تا ژماره یه کی تر خواتان له گه ڵ بێ

هه ر سه رکه وتوو بـــن .

# ڕۆژمێری مانگ

٧/٥ کۆچی دوایی نووسه ری کورد ( عبد الواحد نوری ) (١٩٤٤) .

٧/١٠ کۆچی دوایی زاناو مێژوونووسی کورد (ئه مین زه کی به گ)(١٩٤٨) .

– له شه قامه کانی ( مه قادیشۆ) دا UN ئاگاداری یه کی بلاوکردەوه که هه رکه س یارمه تیی گرتنی ( عیدید) بدات(٢٥)هه زار دۆلار وه رده گرێت(١٩٩٣) .

٧/١١ کۆچی دوایی زاناو نووسه ری کوردستانی تورکیا(محمدعلی عونی)(١٩٥٢) .

٧/١٢ بومه له رزه یه کی (٨ر٧) نمره یی دای له دوورگه ی ( ئۆکۆشیری ) ی یابان و (٢٤٠ ) که س کوژران و زیانێکی زۆر که وت (١٩٩٣) .

٧/١٤ ڕووخانی ڕژێمی پاشایه تی له عیراقدا (١٩٥٨)

٧/١٨ سه ره کی کۆمار و سه ره کی وه زیرانی ( پاکستان ) ده ستیان له کار کێشایه وه (١٩٩٣) .

٧/١٩ لافاو له ویلایه ته کانی ناوه ڕاستی ئه مریکا بووه هۆی کوژرانی (٢٩) که س و (١٠) ملیار دۆلار زیان (١٩٩٣) .

– به ردێکی درایه دائیره ی شوێنه واری سلێمانی ، مێژووی ده گه ڕێته وه بۆ نزیکه ی (٤٠٠٠ ) سال له مه وبه ر ، که ده قێکی شاهانه ی له سه ر نووسراوه به خه تی بزماری (١٩٩٣) .

٧/٢٠ بلاوبوونه وه ی گۆڤاری ( هیوا ) له به غدا (١٩٥٧) .

٧/٢٣ ده ستگیرکردنی ( شێخ مه حمودی حه فید) له لایه ن ئینگلیزه وه (١٩٢٢)

٧/٢٤ کۆچی دوایی ( گیو موکریانی ) (١٩٧٧) .

٧/٢٥ په یمانی (لۆزان ) (١٩٢٣) .

٧/٢٧ لافاو له ( نیپال ) و ( هیندستان ) و ( به نگلادش ) بووه هۆی کوژرانی پتر له (٣٠٠٠) که س و بێ لانه بوونی (٢٠) ملیۆن که س (١٩٩٣)

٧/٣٠ کۆچی دوایی (د. به شیر موشیر ) ی نووسه ری کورد (١٩٦٣) .

(پەیامی ڕاستی) رسالة الحق

مجلة ثقافية شهرية جامعة .. تصدر عـــن:

(( جمعية الكتّاب الاسلاميّين في كوردستان ))



العدد (١٧) / تموز ١٩٩٣ / صفر ١٤١٤

# PAYAMI RASTEE
# (THE TRUE MESSAGE)

A MONTHLY CULTURAL GLOBAL MAGAZINE

ISSUED BY :

KURDISTAN ISLAMIC WRITERS ASSOCIATION
( K.I.W.A.)

NO.17- AUGEST 1993-SAFAR 1414

نرخی (٣) دینـــاره